٣- ئـەم حاڵەتـە وەك سـەرجەم حاڵەتـە دەروونیـەکانی تـر بـە هـیچ جـۆرێ بـە هەڕەشـەو لێدان چارەسەر ناکرێ.

## فرەخواردنی دەماری

ئـەم حاڵەتـە بـەوە جیادەکرێتـە ناویـەناو تـاك کـۆنترۆڵی خـۆی بـۆ نـاکرێ و بڕێکـی زۆر خـواردن دەخـوات ، لەهـەمان کاتـدا بایـەخێکی زۆر دەداتـە شـێوەی نمونـەی جەستەی.

ئـەم حاڵەتـە لـە ١٪ - ١,٥٪ مێینـەدا ڕوودەدات زیـاتر لەتەمـەنی هەرزەکاریـدا. تـاك زۆریـەی کـات بـیری لای خواردنـە ،کـە خـواردن دەبینـی خـۆی پێنـاگیرێ و بڕێکـی زۆر دەخـوات و پاشـان بـۆ ڕێگـرتن لـە زیـادبوونی کێـشی لەشـی پـەنا دەباتـە بـەر خـۆ ڕشـاندنەوە ، بـەکارهێنانی حـەبی ڕەوانـی ، نـان نـەخواردن بـۆ ماوەیـەك، بـەکارهێنانی دەرمانی کەمکەرەوەی شەهیە.

### نیشانەکان و ماکەکان:

- دەشێ هاوشێوەی نەخواردنی دەماری بێت بەڵام بڕێك توندی کەمترە.
- مردنی کوتوپڕ بەهۆی پەککەوتنی دڵەوە.
- تێکـچونی ئاسـتی ئایۆنـەکانی لـەش.( کەمبونـەوەی ئاسـتی پۆتاسـیوم، سـۆدیۆم، کلۆر).
- دڕانی گەدە یان سورێنچك.
- برینی گەدە یان ڕیخۆڵە.
- بونی چەوری لە پیساییدا.
- کلۆربوونی ددانەکان.

### چارەسەر:

- لـە زۆریـەی حاڵەتەکانـدا لـە دەرەوەی نەخۆشـخانە( کلینیکـەکان ) چارەسـەر دەکرێـت لـە هەنـدێ حاڵـەتی تایبەتـدا پێویـست بـە خەوانـدن دەکـات لـە نەخۆشخانە وەکو ترسی خۆکوژی ، کێشەی جەستەیی.

- بەكارهێنانی دەرمان حەبی فلوكستین بە بڕێكی زۆر بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێك.
- چەرەسەری دەرونی لە ڕێی چارەسەری مەعریفی و سلوكی.

## ئایندەی نەخۆش:

بەشێوەیەكی گشتی باشە و چاكدەبنەوە.

# بەشی یانزەیەم:

## پەشێویە دەرونیەکان لە منداڵدا

## ئۆتیزم

## پەشێوی کەمی هۆشپێدان و فرەجولەیی

## بیرکۆڵی

## خۆتەرکردن

## دەستدرێژی بۆ سەر منداڵ

# پەشێویە دەروونیەکان لە منداڵدا

# Child Mental Disorders

یۆنگ دەڵێ: گەر شتێ هەبێ لەمنداڵدا و ئارەزوی گۆرینی بکەین وا باشترە بگەرێین بەشوێنیدا بزانین وا باشتر نیە ئەو شتە لەخۆماندا بگۆرین.

زۆربەی ئەو نەخۆشیانەی لە گەورەدا روودەدەن بە هەمان شێوە لە منداڵیشدا روودەدەن بە تایبەتی پەشێویەکانی مەزاج و دلەراوکێ.

لەم بەشەدا مەبەستمان ئەوە نیە باس لەو پەشێویانە بکەین کە بێگومان گرنگی خۆی هەیە و نیشانەکانی برێك جیاوازە لە نیشانەکانی هەمان پەشێوی لە گەورەدا. بەڵکو هەوڵ دەدەین باس لە هەندێ بابەت بکەین کە زیاتر تایبەتە بە منداڵان ،ئەویش حالەتی ئۆتیزم ، پەشێوی فرەجولەیی و کەمی هۆشپێدان ، بیرکۆڵی، خراپ رەفتارکردن لەگەل منداڵدا هەندێ بابەتی تر.

# ئۆتیزم ( خود تەنهایی )

## Autism

ئـۆتیزم وشـەیەکی یۆنانیـە بـەمانای دابـڕان وگۆشـەگیری دێـت. بـۆ یەکـەم جـار لەلایەن لیۆکەنەر ئەم زاراوەیە بەکارهێنرا.

ئـۆتیزم بریتیـە لـە تێکـچونێکی ئـاڵۆزی گەشـە کـە لـە سـێ سـاڵی یەکـەمی تەمـەنی منداڵدا ڕوودەدات لە ئەنجامی تێکچوونی فرمانەکانی مێشك ودەمار.

ئـۆتیزم توشـی هـەژارو دەوڵەمەنـد ، ڕەش پێـست و سـپی پێـست ، بـاکور و باشـور دەبـێ بـەبێ جیـاوازی. ڕێـژەی توشـبوون نزیکـەی ٣- ٤ منداڵـە لەهـەر ١٠,٠٠٠ منـداڵ و لـە نێردا زیاترە وەك لە مێ بەڕێژەی ١/٣ .

### هۆکاری ئۆتیزم:

١- بۆمـاوە: هەرچـەندە تـاکو ئێـستا ڕۆڵـی بـۆ مـاوە بـە ڕونـی ئاشـکرا نیـە بـەڵام زیـاتر لـە ئاماژەیـەك هەیـە لەمـەر کاریگـەری بۆمـاوە لـە ئـۆتیزم دا بـۆ نمونـە گـەر یـەکێك لـە دوانـە ئـۆتیزمی هـەبێت ئەگـەری ئـەوەی منـداڵی دووەم توشـبێت ٥٠٪ یـە. گـەر خێزانێـك منـداڵێکیان هـەبێ حاڵـەتی ئـۆیتزمی هـەبێ ئەگـەری حاڵـەتی دووەم لەنێوانیاندا ٥٠ هێندەی خێزانەکانی ترە.

٢- هەوکردنـە ڤـایرۆسـیەکان: زیـاتر لـە هـەوکردنێکی ڤـایرەسـی هەیـە کـە توشـی دایکـی دووگیـان یـان کۆرپـەی سـاوادەبێت لـە سـەرەتای ژیانیـدا دەشـێ ببێتـە هـۆی سـەرهەڵدانی ئـۆتیزم وەکـو سـیرۆژەی ئـەڵمانی ، هەوکردنـە ڤـایرەسـیەکانی مێشك، ... هتد.

٣- ئاسـتی وەرگرەکـانی مێـشك: بەرزبونـەوەی ئاسـتی سـیرۆتۆنین و دۆپـامین وئیپینفـرین ونـۆرئیپنفرین لـەکاتی پێـدانی چارەسـەر بـۆ دابەزانـدنی ئاسـتی ئـەم وەرگرانە هەندێك لە نیشانەکان باشتر دەبن بەتایبەتی فرەجوڵەیی.

### نیشانەکانی :

لـە دوای تەمـەنی ١,٥ سـاڵیەوە نیـشانەکان بەدەردەکـەون بـەزۆری لـە نێـوان تەمەنی ٢-٣ ساڵی. زیاتر گرفتەکان لە سێ بواردا ڕوودەدات:

أ- گفتوگۆ (ئاخاوتن).

ب- پەیوەندی کۆمەلایەتی .

ت- گرفت لە بواری ڕەفتاردا ( هەلسوکەوت ).

٤- دووبارەکردنەوەی هەمان یاری چەند جار و چەند جار بەبێ ماندوو بوون و نەبوونی توانای داهێنان لە یاریەکاندا .

٥- بەرەنگاربونەوەی گۆڕانکاری لە یاریەکاندا و زووهەلچوون وەکو خواردن لە دەفرێکی دیاری کراودا یان لەبەرکردنی پۆشاکێکی دیاریکراو ڕازی نەبون بە گۆڕینی.

٦- دابڕانی کۆمەلایەتی و ڕازی نەبونی یاری کردن لەگەلْ خێزان و مندالانی تر.

٧- خاوخلیچکی یان جولەی بەردەوامی بێ مەبەست.

٨- گوێ نەدان بەدەوروبەر زۆرجار دەگاتە ئاستێك کەسوکار وادەزانن مندالەکەیان کەڕبووە.

٩- لەرووی زمانەوە: دواکەوتنی ئاخاوتن ، بێدەنگی یان دەنگەدەنگی بەردەوام ، دووبارەکردنەوەی قسەی ئەوانی تر بەبێ تێگەیشتن لە ماناکەی، وتنی وشەو ڕستەی بێ واتا، پێچەوانەکردنەوەی ئامرازەکان، گرفت لە ناونانی شتەکاندا.

١٠- پێکەنینی بێ هۆ.

١١- لاوازی یان نەبوونی هۆشپێدان و چاونەبرینە چاوی بەرامبەر .

١٢- تێنەگەشتن لە زمانی جەستەو گرفت لە بابەتە بینراوەکاندا.

١٣- دواکەوتنی گەشەی هەستەکان ( بۆنکردن ، بەرکەوتن، تامکردن ).

١٤- هەست نەکردن بە سەرماو گەرما یان ڕاستر بێئاگایی لە سەرما وگەرما.

١٥- ترسان لە هەندێ شت کە پێویست بە ترس ناکات و نەترسان لە هەندێکی تر کە جێی مەترسیە، وەکو ترسان لە دەنگی ئاژەلْ یان فڕۆکە و نەترسان لە ڕاکردن بە سەرشەقامدا کاتێك ئۆتۆمۆبیل هاتوچۆ دەکات.

١٦- دووبارەکردنەوەی هەمان ڕەفتار ، یاری کردن بەدەست و پەلەکان و کێشان بەسەردا و نوشتاندنەوەی پەلەکان بەشێوەیکی ترسناك.

ئـۆتیزم سـەر بەکۆمـەڵێك یـان شـە پەنگێك نەخۆشـیە کـە کـرێن بـە پێـنج جۆرەوە:

١- ئۆتیزم (خود تەنهایە). ﴿لیۆ کەنەر ١٩٤٣﴾

٢- پەشێوی ریتز. ﴿هانز ئەسپەرگەر ١٩٤٤﴾

٣- پەشێوی ئەسپرجەر. ﴿ئەدریا ریت ١٩٦٦﴾

٤- پەشێوی تێکشکانی منداڵی. ﴿سیۆدۆ هیلەر ١٩٠٨﴾

٥- پەشێوی گەشەی گشتی دیاری نەکراو.

## پۆلێنکردنی ئۆتیزم:

بە پێی کۆلمان دەکرێت بە سێ جۆرەوە:

١- ئۆتیزکی کلاسیکی

٢- ئۆتیزم لەگەڵ سکیزۆفرینیا.

٣- ئۆتیزم لەگەڵ گرفتە دەمارییەکان.

## پۆلین کردنی ستیڤن و کوی و فی و ماتسن:

١- ئۆتیزمی نائاسایی.

٢- ئۆتیزمی سانا.

٣- ئۆتیزمی مامناوەند.

٤- ئۆتیزمی توند.

## وەڵامی چەند پرسیارێك:

١- ئایا منداڵانی ئۆتیزم لەرووی زیرەکیەوە دواکەتوترن لەمنداڵانی تر؟

وەك دەزانـین زیرەکـی پێویـستی بـە توانـای وەرگـتن هەیـە لـە دەوروبـەروە لـە رێـی هەسـتەکان، منـداڵی ئـۆتیزم توانـای پەیوەنـدی لەگـەڵ دەوروبـەردا دەپـچڕێ و لـە دونیایـەکی تایبەتـدا دەژی لـە سـەرەتای تەمەنیـەوە، بۆیـە شـتێکی ئاسـاییە کـە ئاسـتی زیرەکیـان کـەمتر بێـت لەمنـداڵانی تـر بـە پێـی توێژینـەوەکان ئامـاژە بـەوە دەدەن کـە ئاستی زیرەکیان کەمترە لە منداڵانی تر بە نزیکەی ٥٠٪.

٢- ئایا دایك باوك بەرپرسن لە توشبونی منداڵەکەیان بە ئۆتیزم؟

بەهیچ جۆرێك. جاران لەو باوەڕەبوون شێوازی پەروەردەكردنی باوان بۆ منداڵەكەیان كاریگەری گەورەی هەیە لە توشبوون بە ئۆتیزم بەڵام ئەنجامی ئەو توێژینەوانەی لەسەر منداڵ و خێزانی ئۆتیزم كراون هیچ پەیوەندیەكیان بەدی نەكردووە لە نێوان شێوازی پەروەردەو ئەگەری توشبون بە ئۆتیزم.

تەنانەت هەندێ بۆچونی پێشتر باسیان لەوە دەكرد گەر دایك لە پەیوەندی لەگەڵ منداڵەكەیدا سارد بێت مەترسی توشبوون بە ئۆتیزم زیاترە ﴿ بەو دایكانەیان دەوت دایكی یەخچال﴾ ، گومانی تێدا نیە كە شێوازی پەروەردەكردن كاریگەری گەورەی هەیە لەسەر ئاینیدەی تاك و شێوازی هەڵسوكەوتی بەڵام نابێتە هۆكارێك بۆ توشبوون بە ئۆتیزم. هەندێكی تر لەو باوەڕەدا بوون گەر باوان نەخۆشی دەرونیان هەبێ منداڵەكانیان ئەگەری توشبونیان بە ئۆتیزم زیاترە وەك لە منداڵانی تر سەبارەت بەم بۆچونەش هیچ توێژینەوەیەك نیە ئاماژە بەمە بدات.

٣- ئایا منداڵانی ئۆتیزم توانای تایبەتیان هەیە؟

بەڵێ رێژەیەكی كەمیان توانای تایبەتیان هەیە وەك ئەوەی دەتوانێت پارچە مۆسیقایەك بژەنێ پاش ئەوەی تەنها یەكجار گوێ بیستی بێ، یان دەتوانێت وێنەیەكی سەرنج راكێش بكێشێت ، یان بابەتێكی بیركاریانەی ئاڵۆز شیبكاتەوە كە كەسانی تر بەدەستیەوە دادەمێنن بەڵام دەشێ نەتوانێت بابەتێكی سادە شیبكاتەوە.

٤- ئایا چاو كاریگەری هەیە لەسەر توشبون بە ئۆتیزم؟

ڕەنگە زۆر كەس تێبینی ئەوەی كردبێ برێكی بەرچاوی منداڵانی ئۆتیزم روخسارو سیمایەكی جوانیان هەیە بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە كەبوون بە چاوەوە هۆكارێك بێت بۆ توشبوون بەم نەخۆشیە پێویست ناكات ناوی كەس بسوتێنی بەبیاوی ئەوەی چاویان پیسە یان پەیوەندی كۆمەڵایەتی خۆت تێك بدەیت لەگەڵ كەسانی تردا لەژێر ئەو بیانوەدا.

٥- ئایا لەرێی شێخ و مەلاكانەوە چارەسەر دەكرێت؟

وەك دەزانین لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا كەسانێك پەیدابوون بازرگانی بە ئیسلامەوە دەكەن لایەنی سۆزداری خێزانەكان بەلای خۆیاندا ڕادەكێشن لەژێر ناوی جیاجیادا بەناوی ئەوەی نەخۆشیە درێژخایەنەكان چاك دەكەنەوە . بۆیە دوور نیە هەیانبێت

لـه پلانـی ئـەوەدا بێـت بڕێـك پـارە لـە خێزانـانی ئـۆتیزم بكێـشێتەوە بـەناوی ئـەوەی هـەموو نەخۆشـییەك چارەسـەر( یـان چارەشـەر) دەكـات ئـەوەی جێـی وتنـە تـاكو ئێـستا هـیچ شـێخ یـان مەلایـەك باسـی لـەوە نـەكردووە تـەنها یـەك منـداڵی چـاك كردبێتـەوە لـە كاتێكـدا لـە وولاتێكـی وەك عەرەبـستانی سـعویەدا زیـاتر لـە ٦٠,٠٠٠ (شەسـت هـەزار) منـداڵی ئـۆتیزم هەیـە. بـەڵام بـە دووری نـازانم لـە وولاتـی خۆمانـدا هەنـدێ لەوانـەی دینارداری دەكەن بەناوی دینداریەوە بڕێك پارەش لە خێزانانی ئۆتیزم بكێشنەوە.

٦- ئایا كوتان دەبێتە هۆی ئۆتیزم؟

مـاوەیكی زۆر لـە ئـەوروپا و ئەمـەریكا خێزانـەكان بـە شـوێن هیوایەكـدا دەگـەڕان تـاكو هۆكـاری ئـۆتیزم بـزانن و هەنـدێ رۆژنامـە هۆكارەكـەی دەگەرانـدەوە بـۆ كوتـانی سـیانی بـەڵام توێژینـەوەكانی تایلـەر و هاورێكـانی ئـەوە روون دەكاتـەوە بـەهیچ جۆرێـك پەیوەندی نیە لە نێوان كوتانی سیانی و ئۆتیزم دا.

٧- پەیوەندی خواردن بە ئۆتیزمەوە چیە؟

زۆر لـە ئێمـە لـەكاتی بـوونی هـەر نەخۆشـیەكدا پرسـیار لـە پزیـشك دەكـەن ئایـا هـیچ خۆراكێـك هەیـە هۆكـاری سـەرهەڵدانی ئـەم حاڵەتـە بێـت یـان هـیچ خۆراكێـك هەیـە كـە تـاك نـە یخوات بـۆ ئـەوەی چـاك ببێتـەوە . سەبارەت بـە پەیوەنـدی نێـوان خـۆراك و ئـۆتیزم زۆر توێژینـەوە كـراوە و زیـاتر لـە بۆچـونێك هەیـە ئەمانـەی خـوارەوە هـەرە بـۆ چـونە گرنـك و ڕاسـتەكانن . بـەڵام ئـەم رێنماییانـە دەبێـت لـە ژێـر چـاودێری پزیـشكدا بێـت بـۆ ماوەیـەكی دیـاری كـراو كـە لـە چـەند هەفتەیـەك تێنا پـەرێ و بـە پێـی سـوود وەرگرتنی منداڵەكە بڕیاری بەردەوام بوون یان ڕاگرتنی ئەم سستەمە دەدرێت.

أ- لابردنی مادەی كازیین كە لە شیردا هەیە.

ب- لابردنی مادەی گلوتین كە لە گەنم ، جۆ ، گە نمە شامیدا هەیە.

ت- بـەكارهێنانی رۆنـی كـەتان و رۆنـی جگـەری ماسـی ئـەو خواردنانـەی ئۆمیگـا ٣ یـان ئۆمیگا شەشی هەیە.

بـەكارهێنانی هەنـدێ ڤیتـامین ئـەی ، بـی ١، ٣، ١٢، ٥،٦ و زنـك و مەگنیـسیۆم و كالیسیۆم بە بڕیكی گونجاو.

بـە پێی مـانوەلی دەستنیـشانكردن و پـۆلێن كردنـی پەشـێویە دەرونیـەكان منـداڵ

دەبێــت لایــەنی کــەم  شــەش نیــشانەی لەمانــەی خــوارەوە هــەبێت دوو نیــشانە لــە گروپــی A و یەك نیشانە لە هەریەك لە C و D بەڵام دەبێت کۆی گشتی بکاتە شەش.

| | نیشانەکان | بەڵێ | نەخێر | نازانم |
|---|---|---|---|---|
| A | لاوازی لە چەندێتی و چۆنێتی هەڵوێستی کۆمەڵایەتی | | | |
| 1 | ئایــا گــرفتی دەربرینــەکانی دەم چــاو ، بــاری جەســتە ، وەڵام نەدانــەوەی ســۆزی بەرامبــەر پێکــەنینی یــان تورەبوونی دایکی هەیە؟ | | | |
| 2 | ئایــا گــرفتی هەیــە لــە دروســت کردنــی پەیوەنــدی لەگەڵ هاوتەمەنەکانیدا؟ | | | |
| 3 | ئایــا کــەمی بایەخــدان وهەوڵــدانی هەیــە لــە بەشــداریکردن لــە یاریــدا ( نــەتوانینی هێنــانی یاریــەك یــان داواکردنــی یــان ئیــشارەتکردن بــۆ یاریەکە )؟ | | | |
| 4 | ئایــا  کــەمی یــان نــەتوانینی گۆڕینــەوەی هەســت وســۆز ی هەیە لەگەڵ چواردەوردا ؟ | | | |
| B | لاوازی لــە چــەندێتی و چــونێتی پەیوەنــدی کــردن و بــەردەوام بوون | | | |
| 5 | ئایــا دواکــەوتن یــان لاوازی توانــای گفتوگــۆی ( نــەتوانینی جێگرتنــەوەی بــە بــەکارهێنانی شــێوازێکی تر ) هەیە؟ | | | |
| 6 | ئایــا لــە حاڵــەتی تــوانینی قــسەکردندا ناتوانێــت دەستپێشخەری بکات و بەردەوام بێت لە گفتوگۆ؟ | | | |
| 7 | ئایــا دووبارەکردنــەوەی هــەمان ووشــە یــان ڕســتەی ( دەشێ زمانی تایبەت بێ بە خۆی ) هەیە؟ | | | |
| 8 | ئایــا گــرفتی هەیــە لــە گۆڕانکــاری لــە یاریــەکان و لــە ئاســایی کردنــەوەی کەســانی تــر  و گرفــت لــە یــاری کردن لەگەڵ هاوەڵەکانیدا ؟ | | | |
| C | بایەخدان چالاکی دووبارە | | | |
| 9 | ئایــا خۆمانــدووکردن  بەیاریــەکی دیــاری کــراوە یــان یــاریکردن بــە یاریــەك  بەشــیوەیەکی زۆر ســنووردار و | | | |

| | | | ناسروشتی و جەختکردنەوە لەسەر چەندبارەکردنەوەی هەیە؟. | |
|---|---|---|---|---|
| | | | ئایا بەرەنگاربونەوەی گۆڕانکاری لە یاری و کەلوپەلی تایبەتی خۆی قاپ وقاچاخ هەیە؟ | 10 |
| | | | ئایا چەندبارەکردنەوەی جولەی لەش بەتایبەتی پەلەکان ، ماندوو و وەرس نەبوون لەو کارەی هەیە؟. | 11 |
| | | | ئایا سووربوون لەسەر بایەخدان بە بەشێکی بچوکی ئەو یاریەی هەیە؟. | 12 |
| | | | کۆی گشتی: ........................ | |

**چارەسەر:**

ئۆتیزم لەو نەخۆشیانە نیە بە تەنها ڕێگەیەك چارەسەر بکرێت بەڵکو لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر ڕێگە چارەکان جیاوازە و زۆرجار زیاتر لەڕێگە چارەیەکمان پێویست دەبێت.

١- گۆڕینی یان باشترکردنی ڕەفتار.

٢- ڕێگەی بنیادنانی فێرکاری.

٣- دەرمان.

ئەگەر منداڵ ڕەفتاری دووبارەو شەرەنگێزی زۆر بێت و گرفت بۆ ئەندامانی خێزان و دەوروبەر دروست بکات دەتوانین دەرمانی دژە سایکۆس بەکاربێنین ، گەر ڕەفتاری دووبارەو شەرەنگێزی و زوو هەڵچونی هەبێت دەرمانەکانی دژە خەمۆکی کاریگەریان زیاترە ، گەر کەمی هۆشپێدانی هەبێت حەبی ریتالین یان هاوشێوەکانی ئەو بەکاردەهێنرێت.هەندێ پێکهاتەی روەکی هەن لە لایەن هەندێ کۆمپانیای ئەو دەرمانەوە دروستکراون تا رادەیەك کاریگەریان هەیە بۆ کەمکردنەوەی هەڵچون و شەرەنگێزی.

١- چارەسەری ئاخاوتن.

٢- چارەسەری پیشەیی.

هەریەکە لەم ڕێگایانە پێویستی بە ڕێنمایی هەیە لەلایەن چارەسازی دەروونی و پزیشکی دەروونی و توێژەری دەروونییەوە و سەبارەت بە دەرمان ئەوە بەتەواوی کاری پزیشکەو بە پێی پێویستی و نیشانەکانی منداڵەکە دەگۆڕێ.

## ڕۆڵی خێزان لە پرۆسەی چارەسەردا :

گومانی تێدا نیە بۆ چارەسەری هەر نەخۆشیەك پێویستمان بە هەماهەنگی نێوان پزیشك و نەخۆش و خێزانی نەخۆش هەیە گەر ئەمە بۆ نەخۆشیەکانی تر ڕاست بێ ئەوە بۆ ئۆتیزم ڕاستیەکە کە بێ ئەوە ناتوانرێت کاری پێویست بۆ منداڵەکە بکرێ .

ڕاهێنانی منداڵ کارێکی زۆر گرنگە تاکو بتوانین ئایندەی منداڵەکە باشتر بکەین زۆر جار پێویستمان بە چارەسازی دەروونی دەبێت لە پرۆسەی چارەسەردا بۆ ڕاهێنان و فێرکردنی باوان چۆن ڕەفتار لەگەڵ منداڵی ئۆتیزم دا بکەن.

## ئەمانەی خوارەوەش هەندێ ڕێنمایین بۆ خێزانەکان :

١- منداڵ فێری ڕەفتار دەبێ لە ئەنجامی پاداشت دانەوە باشترین پاداشتیش سۆزۆخۆشەویستیە.

٢- بۆ فێربوونی ڕەفتاری نوێ دەبێ ئەو ڕەفتارە دابەش بکرێ بۆ چەند قۆناغێك و هەر جارەی بەشێکی فێربکرێ.

٣- هەموو ڕەفتارێك دەبێ بە ڕەفتارێکی پێش خۆیدا تێپەرێ بۆ نمونە پێش ڕاکردن رۆشتنە ، پێش فێربوونی ڕستە وشەیە هەروەها.

٤- هاندان و دەستخۆشکەری لە منداڵ لە کاتی جێبەجێ کردنی هەر هەنگاوێك لەو ڕەفتارەی دەتەوێ فێری بکەیت، گەر نەیتوانی وورە بەرمەدە و منداڵەکە مەشکێنە بەڵکو دووبارە و چەندبارە هەوڵ بدە گەر هەر نەیتوانی هەنگاوێك وەرە دواوە و کارەکە بەش بەشتر بکە بەهەنگاوی سادەتر دەست پێ بکە.

٥- بۆ فێربونی ناو هەوڵ بدە تەنها وشەیەك بەکار بهێنیت و پەیوەنداری بکە بە شتێکی خۆشەوە لای منداڵ تاکو ئاسانتر فێربێت.

٦- زۆر گرنگە منداڵ فێری بکە وەکە بکرێ زۆرجار بۆ بەگەیشتن بەم مەبەستە

جگە لە قسە پێویستمان بە زمانی جەستەو بەرکەوتن دەبێ.

٧- زۆر پێویستە منداڵ فێری کاری رۆژانە بکرێ وەك خۆگۆڕین ، خۆشتن ، ددان شتن، چوونە سەرئاو...... بێگومان ئەمە کارێکی ئاسان نیە خێزانەکان دەتوانن لەرێی چارەسازی دەروونیەوە رێنمایی وەرگرن.

٨- خواردن پێوستیەکە بۆ بەردەوام بوونی ژیان بۆیە گرنگە منداڵ فێربکرێ چۆن خواردن دەخوات پێویستە هەمان مێزبێت (هەمان شوێنی نان خواردن)، هەمان سفرە واتە سفرەکە زوو زوو نەگۆرێ گەر گۆریشمان هەمان رەنگ بکرینەوە و هەمان کورسی و هەمان دەفر و کەوچك ....... هتد.بەکاربێنین.

٩- فێرکردنی چوونە سەر ئاو هەموو رۆژێ لەهەمان کاتدا دوای نان تاکو منداڵ لەسەر کاتەکە رابێت و وورده وورده زیاد دەکرێ.

١٠- بەئاگابون لە نەخۆشیەکانی تر چونکە منداڵی ئۆتیزم ناتوانێت باس لە حالی خۆی بکات بۆیە هەر کاتێ هەندێ نیشانەمان بەدی کرد کە ئاماژە بەخش بێت بۆ بوونی نەخۆشی دەبێ بەئاگابین وەکو نەمانی شەهیەی خواردن و تێك چوونی خەوتن و پەلەی سەر پێست و بەرزبونەوەی پلەی گەرما و هەناسە تەنگی و ... هتد .

## ئایندەی منداڵی ئۆتیزم:

یەك لە شەشیان ژیانێکی ئاسایی بەسەر دەبەن، یەك لە شەشی تریان ئارادەیەکی جیاواز پێویستیان بە هاوکاری دەبێت ، دوو لە سێیان پێویستیان بە چاودێری بەردەوامە.

# پەشێوی کەمی هۆشپێدان و فرەجوڵەیی

## Attention deficient hyperactivity disorder

یەکێکە لە پەشێویە دەروونیەکان کە توشی منداڵ دەبێت بەوە جیادەکرێتەوە کە منداڵەکە بەردەوام گرفتی هۆشپێدان «و | یان» فرەجوڵەیی هەیە بەردەوام لە باری تەکان یان لە باری بزواندندا دەبێت.

**رێژەی توشبوون :**

بە پێی مانوەلی دەستنیشانکردن و پۆلێنکردنی پەشێویە دەروونیەکان رێژەی توشبوون ٣٪- ٥٪ ، بە پێی پۆلێنکردنی نێودەوڵەتی بۆ نەخۆشیەکان رێژەی توشبوون نزیکەی ١,٧٪ دەبێ. بەرامبەر هەموو ٣-٤ نێر مێینەیەك ئەم حاڵەتەی هەیە.

**هۆکاری ئەم پەشێویە :**

١- بۆماوە: لە دوانەی یەك زەردێنەدا زیاترە وەك لە دووانەی دوو زەردێنە و ئەگەری توشبوونی کەسانی پلە یەك ٤-٨ هێندە زیاد دەکات. بە پێی توێژینەوەکەی ئەشیرۆن باس لە رۆڵی کرۆمۆسۆمی ژمارە ٥ و ٦ و١٦ و١٧ دەکات.

٢- وەرزی لە دایکبوون : ئەو منداڵانەی لە وەرزی پایز لەدایك دەبن زیاتر ئەگەری توشبونیان هەیە ، رەنگە هۆکەشی بگەرێتەوە بۆ هەوکردنی ڤایرەسی لە مانگەکانی سەرەتای تەمەندا.

٣- ئاستی وەرگرە دەمارییەکانی مێشك: گرفت لە ئاستی دۆپامین و نۆرئەدرینالین بە هۆکارێکی تر دادەنرێت ، لە کاتی چارەسەردا ئەو دەرمانانە بەکاردەهێنرێ کە کاردەکاتە سەر ئاستی ئەم مادانە.

٤- دەماری و فسیۆلۆجی: کەمی چالاکی و خوێن چوون بۆ بەشی ( پەلی ) پێشەوەی مێشك و بە پێچەوانەوە زۆرچالاکی و چوونی خوێن بۆ پەلی لاچانگ و دواوەی مێشك.

منداڵێکی مێینەی خاوەن ئەم حاڵەتە مێشکی کەمتر شەکر بەکاردێنێ وەك لە مێینەیەکی تەندروست. نێرینەیەکی تەندروست. نێرینەیەکی خاوەن ئەم حاڵەتە.

٥- هۆکاری دەرونی کۆمەڵایەتی: ئەو منداڵانەی لە لانە و خانەی نەوجەوانن بەهۆی کەمی سۆزەوە حاڵەتی کەمی هۆشپێدانیان زیاترە. روداوی دەرونی بە ئازار و تێکچونی هاوسەنگی خێزان هۆکارێکی گرنگی ترە بۆ سەرهەڵدانی ئەم حاڵەتە.

٦- هەندێ هۆکاری دەگمەن: نیشانەی منداڵی ئەلکحولی ، کەمی کێش لە کاتی لە دایکبوون، ژەهراوی بوون بە قورقوشم یان کەمی مادەی زینک بەلام ئەمانە هێشتا جێی مشتومڕن.

٧- جگەرەکێشان ومەی خواردنەوە: دیارە لێرە مەبەستمان منداڵەکە نیە بەڵکو گەر دایك لە کاتی سکپڕیدا جگەرەکێش بێت یان مەی خۆر ئەگەری توشبوون زیاد دەکات.

نیشانەو دەست نیشانکردن بە پێی مانوەلی دەستنیشانکردن و پۆلێنکردن پەشێویە دەرونیەکان:

## نیشانەکانی

❖ لاوازی هۆشپێدان ( لاوازی ئاگایی ).

١- ناتوانێت بایەخ بدات بە ناوەڕۆکی بابەتەکان و زۆرجار هەڵە دەکات بەهۆی کەمتەرخەمیەوە لە فرمانەکانی قوتابخانە یان ماڵەوە.

٢- زوربەی کات گرفتی هەیە لە بەردەوامی هۆشپێدان لە ئەرکەکاندا یان لە کاتی یاری کردندا.

٣- زوربەی کات وادەردەکەوێ کە گوێ ناگرێ کاتی بۆی دەدوێت.

٤- زوربەی کات پەیرەوی ڕێنمایەکان ناکات و ناتوانێت ئەرکەکانی کۆتا بێنێت.

٥- گرفت لە ڕێکخستنی ئەرك و چالاکیەکانی.

٦- زوربەی کات خۆ بەدووردەگرێ یان هەوڵ دەدات بەشداری نەکات لەو چالاکیانەی پێویستی ماندووبونی فکری هەیە.

٧- زوربەی کات شتە پێویستەکان وون دەکات ( یاری،کتێب ، پێنوس.... )

٨- زوربەی کات بە ئاسانی خەیاڵی دەڕوات بە هۆی وورووژێنەری دەرەکی.

٩- زوربەی کات چالاکی رۆژانەی بیردەچێ.

❖ نیشانەکانی فرەجوڵەیی:

١- بەجێهێشتنی شوێنی خۆی لە پۆل یان لە شوێنی تر لە کاتێکدا پێویست دەکات بمێنێتەوە.

٢- ڕاکردن و هەڵبەزو دابەزی بەردەوام لە شوێنی نەگونجاودا.

٣- زوربەی کات گرفتی هەیە لە یاریکردن یان بەشداری کردن لە یاریدا بە هێمنی.

٤- زوربەی کات لە بارێکی ناناسایدا دادەنیشێت وەکو خۆنەشتاندنەوە یان خۆ خوارکردنەوە و بەردەوام یاری بەدەستی یان پێی دەکات و دەیان نوشتێنێتەوە.

٥- زوربەی کات لەسەرپێیە (لەسەر ڕۆشتنە) زوربەی کات وا ڕەفتار دەکات وەکو ئەوەی بەهۆی ماتۆرێکەوە لێبخوردرێت.

٦- زوربەی کات زۆر دەلێ (زوربلێیە).

**نیشانەکانی پشووکورتی ( هەڵەشەیی )**

١- زوربەی کات کە پرسیاری لێدەکرێت خێرا وەڵام دەداتەوە پێش ئەوەی پرسیارەکە کۆتایی بێت.

٢- زوربەی کات گرفتی لە چاوەڕوانیدا هەیە و ناوەستێ تا نۆبەی دێت.

٣- زوربەی کات قسە بە خەڵکی دەبڕێ یان خۆی دەخاتە نێوەندی یاریەوە .

منداڵ دەبێت شەش یان زیاتر لە نیشانەکانی گروپی A یان B هەبێت گەر تەنها شەش دانەی لە گروپی A هەبوو ئەوە جۆری یەکەمە ، گەر شەش دانەی لە گروپی B هەبوو جۆری دووەمە، گەر لە هەردوو گروپە هەر یەکەی شەش نیشانەی هەبوو جۆری سێیەمە.

دەبێت ئەم نیشانانە لە دوو شوێن یان زیاتردا هەبێ ﴿ ماڵ، قوتابخانە، کۆڵان، ....). ئەو نیشانانەی سەرەوە لایەنی کەم شەش مانگ بخایەنێت.

کاریگەری ئاشکرای هەبێت لەسەر ( لایەنی کۆمەڵایەتی، ئەکادیمی، توانای کارکردن ).

لە کاتی بوونی پەشێوی تردا نەبێت وەکو سکیزۆفرینیا، پەشێوی مەزاج ،

دلەكوتیْ، تیكچونی كەسیتی ).

جۆرەكانی:

١- كەمی هۆشپیێدان

٢- فرە جوڵەیی.

٣- كەمی هۆشپیێدان فرەجوڵەیی.

چارەسەر:

١- بەكارهیێنانی دەرمان زیاتر لە جۆرێك دەرمان هەیە بۆ ئەم حاڵەتە بەلاّم دەبیێت بە تەواوی لە ژێر چاودێری پزیشكدا بدرێت بە منداڵ، بە پیێی حاڵەتەكە جۆر و بری دەرمانەكە دەگۆرێت.

٢- زوربەی باوان دەڵیێن كەمكردنەوەی شەكر واتە كەمبونەوەی چالاكی، لەڕاستیدا هیچ بەلگەیەكی زانستی نیە لەمەر ئەم بۆچونە.

٣- هەوڵ بدرێت لە قوتابخانە لەریزی پیێشەوە دابنیشیێت و لە تەنیشت دیوار نەك پە نجەرە تاكو كەمتر خەیاڵی بروات بەهۆی هۆكاری دەرەكیەوە.

٤- سستمی فیێركردنی بە تەنیا یان گروپی بچوك باشترە بۆ ئەم منداڵانە.

٥- هەوڵ بدرێت بە پیێی توانا ئەو ژوورەی ئەم منداڵەی لیێیە كەمترین ویێنە و دەنگە دەنگ و پە نجەرەی تیێدا بیێت بەلاّم نەك بكرێتە زیندان و منداڵیش بەندی.

٦- چارەسەری خیێزانی لەرێی سستەمی پاداشت و پشتگوێخستن: زۆرگرنگە ئەندامانی خیێزان و مامۆستا دەرك بەوە بكەن لە كاتیێكدا ئەم منداڵە كارێكی گونجاو دەكات دەستخۆشی لیێبكەن و هانی بدەن بەلاّم لە كاتیێكدا كارێكی نەشیاو یان هەڵە دەكات پەنا نەبەنە بەر لۆمەكردن و تانەوتەشەر و سزادانی جەستەیی چونكە بەم كارە جگە لە خراپبوونی حاڵەتە هیچی تر بەدەست ناهیێنیێت. بۆیە لەو كاتەندا واباشترە وەلاّم دانەوە بۆ ئەو كارە نەشیاوانە پیشتگوێ بخەیت.

٧- چارەسەری كارزانی (تەڕدەستی) كۆمەلاّیەتی: لەم رێیەوە منداڵ فیێری رەفتارە كۆمەلاّیەتیەكان دەكرێت وەكو چۆنیێتی نان خواردن لەگەڵ خەڵكیدا،

هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵانی تر لەگەڵ میوان ، ......

**ئایندەی نەخۆشەکە :**

چاکبونەوە پێش تەمەنی ١٢ ساڵی روونادات گەر رووبدات لە نێوان تەمەنی ١٢-٢٠ساڵی دەبێت. لە ١٥٪- ٢٠٪ یان لەتەمەنی لاویدا گرفتی تێکچونی کەسێتی یان بەکارهێنانی دەرمانیان دەبێ. ئەگەری خۆکوشتن و بێکاریان زیاترە بەهۆی ئەو تەنگژانەی لە ئایندەدا دەیان بێت.

**تێبینی :**

زۆرجار یەکێك لە باوان لۆمەی ئەوی تر دەکات یان کەس وکار گلەیی لە دایك یان باوك دەکەن سەبارەت بە بوونی ئەم حاڵەتە، دەبێ هەموو بزانین باوان هیچ تاوانێکیان نیە لە سەرهەڵدانی ئەم حاڵەتەدا بەڵام رۆڵی گرنگیان هەیە لە پرۆسەی چارەسەردا.

بۆ ئەوەی چارەسەری گونجار بکرێت دەبێت پزیشك ، باوان، ئەندامانی تری خێزان، مامۆستا هاوکارییەکی تەواوی یەکتربکەن.

# بیرکۆلی ﴿ گرفتی فێربوون﴾

## ﴿ التخلف العقلي﴾

## Learning Disability (Mental Retardation)

بریتییە لە حاڵەتی تەواو گەشەنەکردنی مێشك یان وەستانی گەشەکردنی خانەکانی مێشك پێش لە دایکبوون یا لە سەرەتای لە دایکبون یان لە ساڵەکانی سەرەتایی تەمەندا، بەهۆیەوە ئاستی زیرەکی منداڵ کەمتر دەبێت لە ئاستی ئاسایی و گرفتی دەبێت لە بواری فێربوون و پەیوەندی کۆمەڵایەتی. ئاستی لە ٧٠٪ ی زیرەکی بەرەوخوار بە بیرکۆڵ دادەنرێت.

### پێوەری زیرەکی چییە؟

زۆر جار گوێمان لێدەبێت دەڵێن رێژەی زیرەکی یەکێك (٨٠٪) هی یەکێکی تر (١٠٠٪) یەکێکی تر ژمارەیکی تر و هەندێ جار لە سەرو (١٠٠٪) مووەیە .

ئاستی زیرەکی لەرێی هاوکێشەیەکی تایبەتییە وە دەپێورێ بریتییە لە

تەمەنی عەقلی

----------------- X ١٠٠ = رێژەی زیرەکی لە سەدا

تەمەنی ڕاستەقینە

تەمەنی ڕاستەقینە بریتییە لە بەرواری لە دایك بوون تاکو کاتی پشکنین. تەمەنی عەقلی بریتییە لەو تەمەنەی کە تاك کۆمەڵە کارو چالاکییەك هەیە دەبێ لەو تەمەنەدا بتوانێ جێبەجێی بکات . بۆ نموونە منالێکی (١٠ساڵان ) دەبێ بتوانێ.

١- پێناسەی (١١) ووشە بزانێ لە کۆی (٤٥) ووشە کە ریزبەند کرابن لە سوکەوە بۆ قورس.

٢- نەگونجانی وێنەیەك لە نێوان زنجیرە وێنەیەکدا جیا بکاتەوە.

٣- بتوانێ ڕاڤەی هەندێ لە رووداوەکانی ژیانی رۆژانە بکات.

٤- بتوانێ نزیکەی (٢٠) ووشە بدرکێنێت لە ماوەی یەك خولەکدا.

٥- دووبارەکردنەوەی ژمارەیەکی (٦) خانەیی پاش یەك جار بیستن.

گەر منالەکە لەتەمەنی ١٠ ساڵیدا بتوانێ ئەم کارانە هەمووی ئەنجام بدات

ئەوە تەمەنی عەقلی ١٠ ساڵە .

خۆگەر تــوانی هەنــدێکیان ئــە نجام بــدات وهەنــدێکی تریــان نــەتوانێ واتــە توانــای جێبــەجێکردنی ئــەو شــتانەی هــەبێ کــە منــاڵێکی ( ٨ ) ســاڵان دەیکــات ئــەوە تەمــەنی عەقلی ( ٨ ) ساڵانە .

بــەلام گــەرتوانی ئەمانــە هــەمووی ئــە نجام بــدات و هەنــدێ شــتی زیــادەش بکــات کــە بۆ مناڵێکی تەمەن ( ١٢ )ساڵ تەرخان کراوە ئەوە تەمەنی عەقلی ( ١٢ ) ساڵانە.

واتەبــە پێی هاوکێــشەکەی ســەرەوە مناڵەکــە لــە بــاری یەکەمــدا رێــژەی زیرەکــی ( ١٠٠٪ ) و لەباری دووەمدا ( ٨٠٪ ) ولە سێهەمدا ( ١٢٠٪ ).

## تێبینی :

١- هەر تەمەنێك هەڵسەنگاندنی تایبەتی خۆی هەیە.

٢- پرسیارەکان لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر دەگۆڕێ .

هەرچــەندە زۆربــەی زانایــان لــەو بــاوەڕەدان کــە زیرەکــی لــە رێــی بۆمــاوەوە دیــاری دەکــرێ و ئەگــەری گــۆڕانی کەمــە یــان نییــە بــەلام ڤیرنــۆن لــە توێژینەوەکانیــدا تێبــینی ئــــەوەی کــــرد ئەوانــــەی دەچــــنە زانکــــۆ و پــــە یمانگاکان ئاســــتی زیرەکیــــان بــــە نزیکەی( ١٢ پلە ) بەرزترە لەوانەی لە خوێندن دادەبڕێن .

هــەروەها ئەگــەری گۆڕانکــاری هەیــە لــە ئاســتی زیرەکــی منداڵــدا بەنزیکــەی ( ٥-١٠ پلە ) لە منداڵی زیرەکدا ئەگەرەکە زیاترە وەك لە مناڵا ئاستی زیرەکی کەم بێت.

## زیرەکی و تەمەن :

ئاســتی زیرەکــی تــاك بەشــێوەیەکی بــەردەوام لــە برەودایــە تــاکو تەمــەنی ١٥ ســاڵی هەندێ دەڵێن تا تەمەنی ١٨ ساڵی .

لــە نێــوان تەمــەنی ( ٢٠ -٨٠ ســاڵیدا ) تــاك نزیکــەی ( ٥٠٪ ) ی ژمــارە خانــەکانی توێــژاڵی مێــشکی لەدەســت دەدات بــەلام گــۆڕان لــە ئاســتی زیرەکــی و وەبیرهاتنــەوە تــاکو ئــەو رادەیــە نییــە ، چــونکە گــەلێك هــەن تــاکو دوای تەمــەنی ( ١٠٠ســاڵیش ) هــەر بەهرەمەندن و خزمەتی مرۆڤایەتی دەکەن.

دابەشبوونی رێژەی ئاستی زیرەکی بەسەر هاوولاتیاندا :

ئاسایی : ( ٨٥-١١٥ )

خوار ئاسایی : (٧٠-٨٥)

بیرکۆلی : (٧٠ بەرەو خوار)

سەرو ئاسایی: (١١٥-١٣٠)

سوپیریەر : (١٣٠-١٤٠)

بەهرەمەند (عەبقەری) : (١٤٥ – بەرەو ژوور)

**ئاستەکانی بیرکۆلی:**

١- بیرکۆلی کەم: لەم بارەدا تاك ئاستی زیرەکی لە نێوان ٧٠٪ - ٥٥٪ دەبێت.ئەم جۆرە بیرکۆلییە نزیکەی لە ٨٠٪ حاڵەتەکان پێك دێنێ.لە تەمەنی لاویدا ئاستی زیرەکیان بەهێندەی منداڵێکی ٨ – ١١ ساڵ دەبێت. توانای کۆمەڵایەتی و قسەکردن و چالاکیان نزیك دەبێتەوە لە کەسی ئاسایی و لە سەرەتایی تەمەندا هەستی پێناکرێت و تەنانەت لە خوێندندا لە ساڵەکانی سەرەتایی خوێندندا زۆر هەستی پێناکرێت بەڵام لە پۆلی چوار و بەرەو ژوور هەستی پێدەکرێ.

لە ئایندەدا دەتوانن لە رووی ئابوریەوە پشت بەخۆیان ببەستن کارێکی ئاسان بکەن تەنها لە کاتی گرفتدا برێك هاوکاری ورێنماییان دەوێ.

٢- بیرکۆلی مامناوەند: لەم بارەدا تاك ئاستی زیرەکی لە نێوان ٥٥٪ - ٤٠٪ دەبێت . ئەم جۆرە بیرکۆلییە نزیکەی لە ١٢٪ حاڵەتەکان پێك دێنێت.لە تەمەنی لاویدا ئاستی زیرەکیان هێندەی منداڵێکی ٤-٧ ساڵ دەبێت. فێربوونی چالاکی کۆمەڵایەتی و قسەکردنیان لاوازە و ناتوانن قۆناغی سەرەتایی خوێندن تەواو بکەن لە سێ ساڵی یەکەمی خوێندندا وازدێنن پێویستیان بە هاوکاری و رێنمایی و خوێندنی تایبەت هەیە . لەئایندەدا دەتوانن هەندێ کاری زۆر ئاسان بکەن بەڵام بەردەوام پێویستیان بە هاوکاری و رێنمایی هەیە.

٣- بیرکۆلی توند: لەم بارەدا ئاستی زیرەکی تاك لەنێوان ٣٩٪ - ٢٥٪ دەبێت . خۆش بەختانە ئەم جۆرە بیرکۆلییە تەنها لە ٧٪ حاڵەتەکان پێك دێنێ. تاك لەم حاڵەتەدا گرفتی گەورەی هەیە لە بواری کۆمەڵایەتی و فێربوون و جوڵەی لەش هەروەها توانای قسەکردنیان دوادەکەوێت تا تەمەنی شەش ساڵی رەنگە

درەنگتریش ، سود لەخوێندن وەرناگرن و لە تەمەنی هەرزەکاریدا برێک باشتر دەبن.

٤- بیرکۆلی زۆر توند: لەم بارەدا ئاستی زیرەکی تاك لە خوار لە ٢٥٪ دەبێت و خۆشبەختانە ئەم جۆرە بیرکۆلییە تەنها لە ١٪ حاڵەتەکان پێك دێنێ. منداڵ لەم بارەدا توانا کۆمەلایەتیەکانی گەشە ناکات و توانای قسەکردنی نابێت و ناتوانێت زاڵبێت بەسەر دەرچەکانیدا (میزکردن و پیسایی). دەشێ لە ئایندەدا فێری هەندێ وشە بێت پێویستی بە چاودێری بەردەوامە.

### هۆکاری بیرکۆلی:

١- هۆکاری بۆ ماوە کە پەیوەندی بە کرۆمۆسۆمەکانەوە هەیە .بۆ نمونە نیشانەی داون کە ژمارە کرۆمۆسۆمەکان لە ٤٦ زیاترە، نیشانەی تێرنەر ، نیشانەی کلاین فلتەر.

٢- هۆکاری دەستکەوتوو:

- لەسکی دایکیدا: نەخۆشیەکانی دایك وەکو شەکرە ، بەرزی فشاری خوێن، چارەسەر بە تیشك ، بەکارهێنانی هەندێ دەرمان کە زیان بە کۆرپە بگەیەنێت.یان ژەهراوی بوون بە قورقوشم یان یەکانە ئۆکسیدی کاربۆن.
  - بەکارهێنانی مەی (ئەلکحول).
  - تا تەمەنی دایك زۆرتر بێت ئەگەری بیرکۆلی زیاترە .
  - نەگونجانی گرۆپەکانی خوێن لە نێوان باواندا گەر باوك گروپی خوێنەکەی موجەب بێت و دایك سالیب بێت.(لەم بارەدا دەبێ چارەسەری پێویست بکرێت بۆ رێگرتن )
  - بەدخۆراکی دایك بەتایبەتی لە سێیەکی دووەمی سکدا کە کۆرپە بە خێرایی گەشە دەکات.
  - هەوکردنە ڤایرەسیەکان وەکو سیرۆژەی ئەلمانی و هەوکردنی جگەر و سفلس و کەمی بەرگری بەدەست هاتوو(ئەیدز)
  - لەکاتی لە دایکبوندا.
  - منداڵی نەبەکام پێش وەختی خۆی لە دایك بێ یان دواکەوتن لە کاتی خۆی

یان پرۆسەی لە دایکبوون بەخێرایی بێت یان زۆری پێبچێت.

- نەخۆشیەکانی ویلاش.
- توشبوون بە زەردووی بگاتە ئەو ئاستەی زیان بە مێشک بگەیەنێ.
- کەمی ئۆکسجین کە دەبێتە هۆی لەناوچونی خانەکانی مێشک.
- لە تەمەنی منداڵیدا.
- کوێری یان کەڕی.
- دابران لە خێزان یان نەبونی سۆز و خۆشەویستی لەخێزاندا.
- بـونی پەشـێوی دەرونـی خـەمۆکی یـان سـکیزۆفرینیا.بەرکەوتنـەکانی سـەرکـە زیان بە مێشک بگەیەنێ.
- هەوکردنی پەردەکانی مێشک.
- گرفتی فێربوون یان قسەکردن.

بێگومـان ئـەم هۆکارانـەی سـەرەوە مانـای ئـەوە نیـە تـاك بـە دڵنیایـەوە توشـی بیرکۆلی دەبێت بەڵکو ئەگەری توشبون زیاد دەکات.

تێبینـی: بـەهۆی ئـەوەی ئـەم کەسـانە توانـای لێکدانـەوەو دەرککردنیـان بـە مەترسـی ئـەو ڕەفتارانـەی دەیکـەن کەمـە بۆیـە زۆرجـار لـە لایـەن کەسـانی تـرەوە ئیـستغلال دەکـرێن کاریـان پێـدەکرێت و مافیـان دەخـورێ ، خـۆ گـەر ئـەو تاکـەی ئیـستغلالیان دەکـات خـاوەن حـەزێکی شـەرەنگێزی بێـت ڕەنگـە بـۆ تـاوان و کـاری خـراپ بەکاریان بێنێت.

چارەسەر:

ئـەو هۆکارانـەی چارەسـەریان هەیـە دەبـێ چارەسـەری خێـراو پێویـستیان بـۆ بکـرێ وەکو هەوکردنی پەردەکانی مێشک ، نەخۆشی فینایل کیتۆن یوریا، زەردووی.

هەنـدێ حاڵـەتی تـر هەیـە دەتوانرێـت ڕێگـری بکرێـت لـە ڕوودانـی وەکـو منـداڵبوون لـە تەمـەنی دوای ٤٠ سـاڵی و باشـترکردنی خزمەتگوزاریـەکانی کـە پێـشکەش بـە ژنـی دووگیان و منداڵ دەکرێ لە بنکە تەندروستی و نەخۆشخانەکاندا.

زیـاتر بایەخـدان بـە پـەروەردەی تایبـەت دابـین کردنـی مامۆسـتاو شـوێنی پێویـست بـۆ ئـەو منداڵانـە. چارەسـەری پیـشەی بـەوەی فێـری هەنـدێ کـار بکـرێن وەکـو چـنین و

دارتاشی و باخەوانی ..... بەمەش شادمانیەکە بۆ خۆی کە پشت بەخۆی دەبەستێ و کەمکردنەوەی قورساییشە لەسەر خێزان.

بەکارهێنانی دەرمان تاکو ئێستا دەرمانێکی وانیە کە ئاستی زیرەکی بەرزبکاتەوە بەلام بۆ چارەسەری هەندێ نیشانە کە خێزان ماندوو دەکات دەتوانین دەرمان بەکار بێنین و هەندێ دەرمان هەیە بە ئاگایی زیاد دەکات تا رادەیەك بەسودە بەلام دەبێ بۆ ماوەیەکی درێژ بەکاربهێنرێت.

# خۆتەڕکردن

## Enuresis

**بریتیە لە خۆتەڕکردنی نەویستانە لە کاتی نوستندا پاش تەمەنی ٥ساڵی.**

**پۆلێن کردن:**

**١- بەپێی کات:**

- **لە کاتی نوستندا .**
- **لە ڕۆژدا لەکاتی بەئاگاییدا.**

**٢- بە پێی بونی نیشانەکانی تر:**

- **تاکە نیشانە لە کاتی نەبوونی نیشانەکانی تری پەیوەندار بە کۆئەندامی میز و هەرسەوە.**
- **کۆمەڵە نیشانە لە کاتی بوونی نیشانەکانی تر وەکو میزەچوڕکێ و قەبزی و خۆپیسکردن.**

**٣- بە پێی ماوەی پێشووی ووشکی:**

- **سەرەتایی منداڵەکە هیچ کات وشکی بەخۆوە نەدیوە.**
- **دووەمی منداڵەکە لایەنی کەم ماوەی شەش مانگ خۆی تەڕنەکردووە.**

## نیشانە کلینیکیەکان:

**١- بەخەبەر( بەئاگا ) نەهاتنی منداڵ لە کاتێکدا میزەڵدانی پڕ دەبێت لە میز بەهۆی وەڵام نەدانەوەی بۆ ئاگاداریەکانی میزەڵدان.**

**٢- کەمی ئاستی ڤاسۆپریسین لە کاتی نوستندا کە دەبێتە هۆی زۆرمیزکردن.**

**٣- گرفت لە درکە پەتك و لاوازی میزەڵدان.**

**٤- هەوکردنی میزەڵدان.**

## ڕێژەی توشبوون:

**لە ٢٠٪ ی منداڵانی تەمەن ٥ ساڵی لایەنی کەم مانگی جارێ خۆتەڕدەکەن.**

**لە ١٠٪ی منداڵانی تەمەن ٧ ساڵی لایەنی کەم مانگی جارێ خۆتەڕدەکەن.**

**لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا لە ٨٪ ی کوڕان و لە ٤٪ ی کچان گرفتی خۆتەڕکردنیان**

هەیە.

لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا نزیکەی لە ١٪ - ٢٪ گرفتی خۆتەرکردنیان هەیە.

لە ٨٠٪ ی خۆتەرکردنەکان بەشەو دەبێت و لە ٢٠٪ بە رۆژ.

**هۆکاری خۆ تەرکردن:**

١- بۆماوە: گەر یەکێك لە باوان خۆتەرکردنی هەبێت ئەگەری بوونی هەمان حاڵەت لە منداڵەکەیدا لە ٤٣٪ دەبێت و گەر هەردوو باوان هەیان بێت ئەگەرەکە بۆ لە ٧٧٪ بەرزدەبێتەوە. ئەگەر باوك خۆتەرکردنی هەبێت ئەگەری بوونی لە منداڵەکەیدا زیاترە وەك لەوەی دایکی حاڵەتەکەی هەبێت.

٢- هۆکاری دەروونی: بوونی پەشێوی دەروونی یان گرفتی سۆزداری ئەگەری خۆتەرکردن زیاد دەکات.

٣- گرفتەکانی میزەڵدان: بوونی هەوکردن ، ناتەواوی لە توێکاری میزەڵداندا، ناتەواوی زکماکی ،بچوکی میزەڵدان.

٤- ئارگنین ڤاسۆپریسین «هۆرمۆنی دژمیزکردن»: کاتێك منداڵ دەنوێت ئاستی ئەم هۆرمۆنە بەرزدەبێتەوە و بۆیە دەبێتە هۆی کەم میزکردن . لەو منداڵانەی خۆتەردەکەن ئەم هۆرمۆنە بەرز نابێتەوە یان درەنگ بەرزدەبێتەوە بۆیە میزێکی زۆر دێتە میزەڵدان و خۆیان پێکۆنترۆڵ ناکرێ.

٥- دواکەوتنی گەشەی کۆئەندامی دەمار: لەم بارەدا گەشەی کۆئەندامی دەمار دوادەکەوێت بۆیە کاتێك میزەڵدان پڕ دەبێت ئاگاداری مێشك ناکاتەوە و ئەویش بەکاری خۆی هەڵناسێ .

٦- خواردن وخواردنەوە: هەندێ خواردن و خواردنەوە لە شەودا وا لە منداڵ دەکات زیاتر میزبکات بۆیە وا باشە بە پێی توانا ئەو بابەتانە لە منداڵ قەدەغە بکرێ یان کەم بکرێتەوە لە شەودا.

٧- قەبزی: پەستانی بەردەوام لەسەر میزەڵدان دروست دەکات و دەبێتە هۆی گرژبوونی میزەڵدان و زوو میزکردن.

٨- تەنگژەکانی خەو : هەندێ لە باوان باس لەوە دەکەن خەوی منداڵەکەیان قورسە «قوڵە» بۆیە خۆی تەردەکات ، خۆتەرکردن پەیوەندی بەمەوە نیە

چونکه له هەموو قۆناغەکانی خەودا خۆتەرکردن روودەدات.زیاتر له منداڵانی تر حاڵەتی رۆشتن بەدەم خەوەوەیان هەیە یان خەوی ناخۆش دەبینن.

چارەسەر:

١- بەبێ دەرمان:

- بەکارهێنانی زەنگی ئاگادارکردنەوە: له ساڵی ١٩٣٨ دروست کراو دەبێت بۆ ماوەی نزیکەی ١٥ هەفتە بەکاربهێنرێت و نزیکەی له ٧٥٪ ی منداڵان سودی لێوەردەگرن بەڵام پاش ڕاگرتن نزیکەی له ٤١٪ حاڵەتەکەیان بۆ دەگەڕێتەوە.

کارکردنی ئەم ئامێرە پشت دەبەستێت بەوەی لەگەڵ یەکەم دڵۆپە میزدا زەنگێک لێدەدات کە دەبێتە هۆی بەخەبەرکردنەوەی منداڵەکە یان باوانی منداڵەکە ، دەبێ منداڵەکە هەڵسێ و بەشەکەی تری میزەکەی له دەرەوەی جێگە تەواو بکات.بۆیە لەم جۆرە چارەسەرەدا هاوکاری باوان زۆر گرنگە.

- پاداشت دانەوە: لەرێی بەکارهێنانی خشتەیەکی تایبەت و هەندێ وێنە یان ئەستێرە، پاش هەر شەوێکی ووشك منداڵەکە ئەستێرەیەك دەنێ بە خشتەکەوە یان وێنەی گوڵێك، هەرکاتێ چەند شەوێ بەسەر یەکەوە بەووشکی خۆی ڕاگرت دیاریەکی دەدرێتێ.بەم ڕێگەیە نزیکەی له ٢٥٪ یان سوود وەردەگرن و پاش ڕاگرتنی له ٥٪ یان حاڵەتەکەی بۆ دەگەڕێتەوە.
- ڕاهێنانی بەهێزکردنی میزەڵدان : بەوەی منداڵ له ڕۆژدا فێردەکرێت میزەکەی دوا بخات و میز له میزەڵدانەدا کۆبکاتەوە نزیکەی له ٦٦٪ یان تاڕادەیەك سوودمەند دەبن و له ١٩٪یان چاکدەبنەوە بە تەواوی.
- کەم کردنەوەی خواردنەوەی چا ، قاوە، شەربەت له شەودا بە تایبەتی له کاتی نزیکەو نوستن.

١- بەکارهێنانی دەرمان: مەبەست له بەکارهێنانی دەرمان زیادکردنی قەبارەی میزەڵدان یان کەمکردنەوەی بڕی میزە یان هەردووکیان.وەکو دیسمۆپریسین، تۆفرانیل و ئۆکسی بیوتارین .

تێبینی:

- زۆرگرنگــە لایــەنی دەرونــی منــداڵ رەچــاوبکرێت و نەشــکێنرێت گــەر خــۆی تــەرکرد بــە تایبــەتی لەبــەر چــاوی خوشــك وبراکــانی چــونکە بــە شــکاندنی منــداڵ یــان لێدانی حاڵەتەکە خراپتر دەبێت.
- بەکارهێنانی هەردوو چارەسەر لە یەکێکیان کاریگەرترە.
- دەبێــت دەرمــان لــە ژێرچــاودێری پزیــشکدا بــەکاربهێنرێ چــونکە کۆمــەڵێك زیــانی لابــەلایی هەیــە لــە بــەکارهینانی دەرمــان دەکەوێتــەوە پزیــشك شــارەزایی تێیــدا هەیــە ســەرەڕای ئــەوەی بــەکارهێنانی بــڕی پێویــست بــۆ هــەر تەمــەنێك لەلایەن پزیشکەوە دیاری دەکرێت.

# دەستدرێژی بۆ سەر منداڵ ( خراپ هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵ )

# Child abuse

ئەمە یەکێکە لە بابەتە گرنگەکان کە زوربەی سەرچاوە زانستیەکان بایەخێکی گەورەی دەدەنێ و لە رۆژگاری ئەمرۆدا بە یەکێك لە تایتلە گرنگەکان دادەنێ.

## ئەم خراپ هەڵسوکەوت کردنە بە گەلێك شێوە دەبێت:

١- دەستدرێژی جەستەیی.

٢- دەست درێژی سێکسی.

٣- خراپ هەڵسوکەوتی سۆزداری.

٤- پشت گوێ خستنی جەستەی.

٥- دواکەوتی گەشە کە هۆکەی ئۆرگانیك ( جەستەیی ) نەبێ.

## ئەو نیشانانەی کە ئاماژە بەخشن بە دەستدرێژی جەستەیی:

١- برینداری یان سوتاوی دووبارە ببێتەوەو بێ پاساو بێت واتە هۆکارەکەی روون نەبێت.

٢- راڤەی نادروست بۆ برینداری و سوتان و زیانی جەستەیی .

٣- چارەسەر نەکردن یان دواکەوتن لە چارەسەر بەبێ پاساو.

٤- زۆر سزادانی جەستەیی.

٥- ترسان لە گەڕاندنەوە بۆ ماڵ.

٦- توندوتیژی بەرامبەر دەوروبەر ( کە هۆکارێکی دەرونی نەبێت ).

## ئەو نیشانانەی کە ئاماژە بەخشن بۆ پشت گوێ خستنی جەستەیی:

١- برسێتی بەردەوام.

٢- بایەخ نەدان بە پاکوخاوێنی و پۆشاك.

٣- دواکەوتن و نەهاتن بۆ خوێندنگە.

٤- چارەسەرنەکردنی لە کاتی نەخۆشیدا.

٥- کەمی رێزگرتنی خود و لاوازی پەیوەندی لەگەڵ هاوتەمەنەکانی.

## ئەو نیشانانەی کە ئاماژە بەخشن بە دواکەوتنی گەشە کە هۆکەی

جەستەیی نیە :

١- دواکەوتنێکی ئاشکرای گەشە.

٢- کەمی کێش.

٣- ڕوتانەوەی قژ.

٤- لاوازی پتەوی ماسولکەو گرفتی پێست.

## ئەو نیشانانەی کە ئاماژە بەخشن بە پشت کوێ خستنی سۆزداری :

١- ڕێز نەگرتنی خود یان کەم ڕێزی بەرامبەر بە خۆی.

٢- گرفتی لە ناکاوی ئاخاوتن.

٣- کەمبونەوەیەکی ئاشکرا لە هۆشپێدان یان بە ئاگایی.

٤- پێنەگەشتنی لایەنی کۆمەڵایەتی و سۆزداری.

٥- زیان بۆ خۆ گەیاندن.

٦- هەڵهاتن ( ڕاکردن )

٧- ئەو پەری توندوتیژی یان پشت بەستن بە کەسانی تر.

## ئەو نیشانانەی ئاماژە بەخشن بە دەست درێژی سێکسی :

١- نەبونی باوەڕ بە کەسانی گەورە یان زۆر هەڵسوکەوت و کراوەیی لەگەڵ کەسانی گەورەدا.

٢- ترس لە کەسانێکی تایبەت.

٣- دابڕان لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە یان حەز بە تەنهایی کردن یان کەسانێکی ناوەکین.

٤- پەشێویەکانی خەو وەکو ترسان لە نوستن بە تەنهایی ، خەوی ناخۆش یان مۆتەکە ( مێردەزمە )، خۆتەڕکردن ، ترسان لە تارکی پێویستی بە ڕوناکی هەیە تاکو بنوێت.

٥- دوودڵی یان ڕازی نەبوونی بەشداری کردن لەو چالاکیانەی پێویستی بەوەیە خۆی بگۆڕێت.( پۆشاکەکانی بگۆڕێت ).

٦- خراپ بەکارهێنانی دەرمان یان مادە هۆشبەرەکان.

٧- ئارەزوویەکی نائاسایی سەبارەت بە کۆئەندامی زاوزێی مرۆڤ یان ئاژەڵ.

٨- ترسان لە خۆشتن یان ژووری داخراو.

٩- ترسان لە پشکنینی پزیشکی بە تایبەتی گەر پێویست بەوە بکات پۆشاکەکانی هەڵبداتەوە یان لایبەرێت.

١٠- سووربونەوە یان شین بونەوەی کۆم، خوێن بەربوون لە دامێن یان کۆم، هەوکردنی کۆئەندامی میز، ئازار لەکاتی میزکردندا یان پیسایی کردندا، نارەحەتی لە رۆشتندا یان لە دانیشتندا و هەستکردن بە ئازار، رەنگ بوونی پۆشاکەکانی ژێرەوە.

١١- سکبوون.

چارەسەر:

زوو دەستنیشانکردن و نهێنی پارێزی و هەڵسەنگاندن و پشکنینی منداڵ لە رووی جەستەیی و دەرونی و فکری و گەشەکردنی سێکسی و سۆزدارییەوە.

هەڵسەنگاندنی ئەوەی ئایا کەسانی تر لە خێزانەکەدا یان لەو ناوەندە ئەگەری هەمان مەترسیان هەیە. ئایا لەم بارە پێویستی بە ئاگادارکردنەوەی پۆلیس هەیە. لە سەرجەم قۆناغەکانی چارەسەرکرندا بەشداری پێکردنی باوان یان ئەو کەسەی سەرپەرشتی قوربانیەکە دەکات.

توێژەری کۆمەلایەتی و چارەسازی دەرونی رۆڵی گەورە و گرنگیان هەیە لە پرۆسەی چارەسەرکرندا. لە سەرو ئەمانەوە لە هەمووی گرنگتر منداڵەکە یان قوربانیەکە پێویستی بە چیە.

## بەشی دوانزەیەم:

## پەشێویەکانی پاش منداڵبوون

## دڵتەنگی پاش منداڵبوون

## خەمۆکی پاش منداڵبوون

## سایکۆسسی پاش منداڵبوون

## دروست نەبونی پەیوەندی پاش منداڵبوون

# پەشێویەکانی پاش منداڵبوون

## Postpartum Disorders

سکبون و منداڵبوون دوو قۆناغی سروشتین لە تەمەنی مێینەدا ، ڕەنگە کەم مێ هەبێت حەز بەم دوو قۆناغە نەکات. ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە تەنها باس لە پەشێویەکانی پاش منداڵبوون دەکەین.

**دەتوانین ئەو پەشێوی و حاڵەتانە بکەین بە چوار جۆرەوە:**

١- دڵتەنگی پاش منداڵبوون: ئەم بارە نزیکەی لە ٥٠٪ - ٧٠٪ مێینە هەیەتی پاش منداڵبوون بە حاڵەتێکی نەخۆشی دانانرێت بەڵکو ئاساییە و لە چەند ڕۆژی پاش منداڵبوون بەتایبەتی پێنج ڕۆژی یەکەمی دوای منداڵبوون دایک هەست بە دڵتەنگی دەکات و جارجار دەگری لەبەرخۆیەوە ، خەوی تێکدەچێت واتە بە نارەحەت خەوی لێدەکەوێت یان ناتوانێ بە پێی پێویست لە خەودا بمێنێتەوە، ترسی ئەوەی دەبێت نەتوانێت کۆرپەکە بە خێویکات،هەست بە نائارامی دەکات.

هۆکاری ئەم دڵتەنگیە بۆ گۆڕان لە ئاستی ئیسترۆجین و پرۆجیستیرۆن دەگەڕێتەوە کە پاش منداڵبوون بە خێرایی دادەبەزێت.

ئەگەری ئەم حاڵەتە زیاترە لەوانەی:

- یەکەم جارە منداڵیان ببێت.
- پێشتر گرفتیان هەبووە لە کاتی سوری مانگانە کە پێی دەڵێن نیشانەی پێش سوری مانگانە.
- لاوازی پاڵپشت و خۆگونجاندنی کۆمەڵایەتی.

**چارەسەر:**

لەبەر ئەوەی ئەم بارە نەخۆشی نیە بۆیە پێویستی بە دەرمان نیە بەڵکو تەنها برێك پاڵپشت کردن و دڵنیایی کردنەوەی دەوێ. لە ماوەی دوو بۆ سێ ڕۆژدا ئاسایی دەبێتەوە.

ئایندەی ئەم حاڵەتە: زوربەی زۆریان دەگەڕێنەوە باری ئاسایی و هەندێکی

کەمیان گەر دڵتەنگیەکەی زۆر بێت ڕەنگە ببێتە حاڵەتی خەمۆکی پاش منداڵبوون.

٢- خەمۆکی پاش منداڵبوون: لە ماوەی شەش هەفتەی یەکەمی پاش منداڵبوون ڕوودەدات ، ئەگەری سەرهەڵدانی لە ١٠٪ -١٥٪ دەبێت .

نیشانەکانی:

- هەستکردن بە دڵتەنگی و گریان.
- بێخەوی و خەوی ناخۆش.
- کەمبونەوەی ئارەزووی خواردن.
- کەمبونەوەی تەرکیز و لاوازی توانای بڕیاردان.
- بیری سلبیانە سەبارەت بەخۆی کە ناتوانێت بایەخ بدات بە کۆرپەکەی.
- دڵەڕاوکێی زۆر سەبارەت بە تەندروستی کۆرپەکەی و گومان دەبات بەوەی کۆرپەکەی ناتەواوی هەیە یان نەخۆشی هەیە.
- بیری خۆکوژی و تەنانەت بیری زیان گەیاندن بە کۆرپەکەی.

**ئەگەری ئەم حاڵەتە زیاترە لەوانەی:**

- ژیانیان بڕێکی زۆر تەنگژە و گرفتی هەیە.
- مێژووی پەشێوی دەرونیان هەیە.
- تەمەنیان کەمە.
- پەیوەندی هاوسەریان لاوازە.
- پاڵپشتی کۆمەڵایەتیان لاوازە.
- سکیان بووە بە بێ پلان دانان ،سکی نەخوازراو.
- شیری خۆیان نادەنە منداڵ.
- بێکارن.

هۆکاری ئەم حاڵەتە دەگەڕێتەوە بۆ خێرا دابەزینی ئاستی هۆرمۆنەکان پاش منداڵبوون.

**چارەسەر:**

بە پێی توندی حاڵەتەکە ڕەنگە پێویست بکات لە نەخۆشخانە بخەوێنرێت، بە

تایبەتی گەر مەترسی لەسەر ژیانی خۆی یان کۆرپەکەی هەبوو.

بەکارهێنانی دەرمانی دژەخەمۆکی. دەبێت پزیشك ئەوە رەچاو بکات ئەم دەرمانانە بڕێکی زۆریان لە شیرەوە دێنە دەرێ بۆیە دەبێت ئەو جۆرەیان هەڵبژێرێ کە مەترسی بۆ کۆرپە دروست ناکات یان کەمترین مەترسی هەیە.

## ئایندەی حاڵەتەکە:

زوربەیان لە ماوەی کەمتر لە شەش مانگدا چاکدەبنەوە بە بەکارهێنانی دەرمان و رێنمایی پێویست، گەر تاك چارەسەر وەرنەگرێت مەترسی ئەوەی هەیە ببێتە حاڵەتێکی درێژخایەن و چەند توێژینەوەیەك ئاماژە بەوە دەدەن ئەو تاکانەی چارەسەر وەرناگرن پاش ساڵێك لە منداڵبونەکە هێشتا لە ٥٠٪ یان خەمۆکیان ماوە.

١- سایکۆسسی پاش منداڵبوون: ئەم پەشێویە لە هەر ٥٠٠ مێینە پاش منداڵبوون بوون یەکێکیان توشی ئەم حاڵەتە دەبێت (٠,٢٪) لە ماوەی چوار هەفتەی یەکەمی پاش منداڵبوون روودەدات، بەتایبەتی لە نێوان هەفتەی ٢-٤ دا.

## نیشانەکان:

- بێخەوی بەبێ ئەوەی کۆرپەکەی بگری.
- تێکەڵ کردن و گرفتی یادەوەری.
- گۆڕان لە بواری مەزاجدا بە ماوەیەکی زۆر کورت بۆ نمونە پێدەکەنێ و پاش ساتێکی کەم دەست دەکات بە گریان زۆرجار بەبێ ئەوەی هۆیەك هەبێ بۆ هیچیان.
- بوونی وەهم سەبارەت بە کارمەندانی نەخۆشخانە یان کەسوکاری.
- بوونی وەهمی خۆبەگەورە زانین رەنگە خۆی بە کەسێك بزانێ کە سروش (وەحی) بۆ هاتووە و داوابکات لە کەسوکاری شوێنی بکەون.
- زۆرناخاوتن و خێرا ئاخاوتن.
- بێ ئۆقرەیی و فرەجوڵەیی.
- هەندێجار خەمۆکی و دڵەراوکێی زۆر.
- بیری خۆکوژی و کۆرپەکوژی، تەنانەت لەم حاڵەتەشدا کە باری عەقلی و

هەڵسەنگاندن پەشێویەکی زۆری پێوەندیارە و زۆرجار تاك بەرپرس نیە لەوەی دەیکات ئەگەری خۆکوژی زیاترە لە کۆرپە کوژی .

چارەسەر:

بە پێی نیشانەکان دەگۆرێت لە بەکارهێنانی دەرمانی دژەسایکۆس و دژەخەمۆکی و دەرمانی جێگیرکردنی مەزاج وەهەندێجار گەر نەخۆش دەرمان نەخوات یان سوود لەدەرمانەکان وەرنەگری بە تەزووی کارەبا چارەسەردەکرێ.

ئایندەی تاك:

زوربەیان چاکدەبنەوە بەلام مەترسی دووبارەبونەوەی هەیە لە کاتی منداڵبوونی ئایندەدا. بۆیە پێویستە رێنمایی تاك بکرێ سەبارەت بەو حاڵەتەو لەسکەکانی ئایندەدا کاری پێویستی بۆ بکرێت. بە هیچ جۆرێ پێویست بەوە نەکات سەردانی بازرگانەکانی ئایینیان پێ بکەیت و بوونی حالەتەکە بۆ جنۆکە بگەرێننەوە و بریکی زۆر پارەکەت لێبسەنن.

٢- دروست نەبوونی پەیوەندی: پاش منداڵبوون بە شێوەیەکی سروشتی و ئاسایی پەیوەندیەکی پتەو لە نێوان دایك و کۆرپەکەی دروست دەبێت و هەریەکەیان هۆگری ئەوی تر دەبێت، بەلام لەم حاڵەتەدا ئەم پەیوەندیە دروست نابێت و لەبری خۆشەویستی رق دروست دەبێت دایك هەست بە هیچ سۆزێك ناکات بەرامبەر بە کۆرپەکەی و توند دەبێ لەگەڵیدا و هەوڵ دەدات زیانی پێ بگەیەنێت.

چارەسەری ئەم حاڵەتە لە یەکەی بەپیی فرێند (هاورێی منداڵ) وە دەست پێدەکات و چارەسەری هەر پەشێویەك کە دایك هەیبێت و ببێتە هۆی ئەو هەڵوێستە سلبیەی بەرامبەر بە کۆرپەکەی و چارەسەری دەرونی لەرێی چارەسەری سلوکی و هزریەوە زۆر بەسودە.

# بەشی سیانزەیەم:

## پەشێویەکانی سێکس:

قۆناغەکانی ووروژاندنی سێکس لای نێرو مێ

لادانە سێکسیەکان

ئاوهێنانەوە ( خۆڤەرەساندن )

فراندن

ساردی سێکسی

دەست درێژی سێکسی

# پەشێویەکانی سێکس

## Sexual disorders

وەك دەزانین سێکس بەشێکی گرنگە لە ژیانی مرۆڤایەتی و سەرجەم بونەوەران (هەندێکی زۆر کەم نەبێت) لە ئەنجامی کاری سێکیەوە هاتونەتە دونیای بوون، لەم بەشەدا هەوڵ دەدەم برێك باس لە قۆناغەکانی سێکس و هەندێ لادانی سێکسی و چەند تۆپیکێکی تر بکەم، بە پشتیوانی خوا لە ئایندەدا پەرتوکێکیان دەبێ لەمەر ئەم بابەتەو بە درێژتر سەبارەت بە سەرجەم بابەتەکان دەدوێین.

### قۆناغەکانی وورووژاندنی سێکسی لای نێرو مێ:

دەتوانین وورووژاندی سێکی هەر لەسەرەتای دەستپێکردنەوە تاکو کۆتایی ئەو کارە بکەین بە چوار قۆناغەوە:

- لای نێر :

١- وروژاندن : ( Excitement )؛ لە ماوەی چەند چرکەیەکدا دەست پێ دەکات بەهۆی خەیالکردنەوە، بینین، یان هەر ڕێگەیەکی تر دەشێت چەند خولەکێك تا چەند کاژێرێ بخایەنێ...!

گۆڕانکارییەکان بریتی یە لە ڕەپ بوون ( erection ) و گرژبوونی کیسەی هەلگری گونەکان و دەردانی برێك شلەی لینجی بریسکەدار کە تۆی تێدایە و لە ڕووی لاشەیی یەوە .

- خێرا لێدانی دڵ.
- بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.
- گرژبوونی ماسولکەکان.
- هەناسە سواری و خێرا هەناسەدان.
- عەرەق کردنەوە.

٢- گرد: ( Plateau )؛ بەردەوام بوونی گۆڕانکاری یەکانی قۆناغی یەکەم لەگەڵ دەردانی برێکی کەم شلە کە تۆی تێدایەو خۆ ئامادەکردنێکە بۆ قۆناغی لوتکە.

٣- لوتکە: ( Orgasm ) ئەمیش دوو بەشە:

أ- گرژبوونی گونەکان و پرۆستات، کە لەم قۆناغەدا کەسەکە هەست دەکات کە ئاو هاتنەوەی نزیك بوومتەوە ، ناتوانێ خۆی لێ بپارێزێت.

ب- ڕژاندنی تۆواو .هەست کردن بە جۆرێکی تر لە خۆشی.

٤- پوکانەوە : ( Resolution ): بریتی یە لە گەڕانەوەی تاك بۆ باری پێش ئەم سێ قۆناغە کە ماوەی (١٠-١٥) خولەکی دەوێت و کەسەکە بە قۆناغێکدا تێدەپەڕێت کە پێی دەڵێن ماوەی وەلام نەدانەوەی ووروژێنەکان (Refractory period) ئەو ماوەیە یە کە تێیدا تاك ناتوانێ کاری سێکسی دووبارە بکاتەوە. ئەمەش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر و لە هەمان کەسدا لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی تر و لە تەمەنێکەوە بۆ تەمەنێکی ترجیاوازی هەیە،کە دەشێ چەند کاژێری بخایەنێ یان چەند ڕۆژێ.

• لای مێ:

١- ووروژاندن : ( Excitement ): لای مێ ینە بریتی یە لەو قۆناغەی چەند چرکەیەکی دەوێت (٥-١٥) چرکە بۆ تەڕبوونی زێ - کێلەك (فەجاینا) و دەشێ چەند خولەکێ تاچەند کاتژمێرێ بخایەنێ . گۆڕانکاری لاشەی هاوشێوەی نێرینەیە.

٢- گرد : ( Plateau ): بەردەوام بوونی گۆڕانکاری یەکانی قۆناغی یەکەم لەگەڵ فراوان بوون و بەرزبوونەوەی زێ – کێلەك (فەجاینا) (بەشی ٢/٣ ی ناوەوەی ) بەرەو منداڵدان ، منداڵدانیش کە لە باری ئاساییدا بەسەر میزەڵدانەدا چەماوەتەوە بەرەو دواوە ڕاست دەبێتەوە.

٣- لوتکە : ( Orgasm ) : لەم قۆناغەدا مێینە هەست بە چێژێکی تەواوەتی دەکات لە کاری سێکسی و هاوشێوەی چێژی نێرینە بەلام لە مێینەدا ڕژانی تۆی لەگەڵدا نیەو چاوەڕوان ناکرێت کەی ڕوو ئەدات و هەندێك جار مێینە لە قۆناغی گردەوە دەچێتە قۆناغی پوکانەوە ( Resolution ) بە بێ ئەوەی بە قۆناغی ئۆرگازم تێپەڕێت. لەم قۆناغەدا هەردوو دەرچەی کۆم و میز تەسك دەبنەوە.

٤- پوکانەوە : ( Resolution ): ئەم ماوەیە زۆر کورتەو مێ ینە یەکسەر

دەتوانێـــت جـــارێکی تـــر کـــاری سێکـــسی بکـــات ،بۆیـــە مـــاوەی ( Refractory Period ) لە مێ ینە زۆر کورتەو هەندێ جار لە کورتیدا نا پێوەرێت.

## لادانە سێکسی یەکان

## ( Sexual deviation )

پێناسە و جۆرەکانی لادانە سێکسی یەکان گەلێ زۆرە، زۆرجار ئەوەی لەکۆمەڵگەیەکدا بەلادانی سێکسی دادەنرێت دەشێ لەکۆمەڵگەیەکی تردا بەلادان دانەنرێت تەنانەت لەهەمان کۆمەڵگەدا ئەوەی تا دوێنێ بەلادان دائەنرا ڕەنگە ئەمڕۆ لادان نەبێ و ئەوەی لەبارودۆخێکدا بەلادان دادەنرێت لەبارودۆخێکی تردا بەلادان دانانرێت , نەك تەنها کۆمەڵگە بەڵکو هەڵوێستی یاساش بەپێ ی کات و شوێن دەگۆرێ بەرامبەر بەلادانەکان بەڵکو هەندێ جار هەڵوێستی ئاینیش دەگۆرێ بەرامبەر بەهەندێ لادانی سێکسی بەتایبەتی کەلادانەکە لەنێوان دوولاداندا بێت و تاك کەمترین زیانیان پەیرەو بکات.

ئەوەی لێرە باسی لێوە دەکەین بۆچوونی کۆمەڵگەی خۆمانە پاڵپشت بە بۆچوونی ئاینی ئیسلام هەرپەیوەندی یەکی جنسی لەدەرەوەی سنووری ژن و مێردا بکرێت بەلادان دادەنرێت و تەنانەت هەندێ لەپەیوەندی یە سێکسی یەکان لەنێوان ژن و مێردا گەر پێچەوانەی ڕێنماییەکانی ئیسلام بێت بەلادان دادەنرێت.

پەرتوکە زانستیەکانی ڕۆژئاوا هەر ماوەیەك یەکێك لە لادانەکان لادەبەن لەبەر هۆیەك یان هۆیەکی تر بۆیە هەندێ لادان کە لێرەدا باسم کردووە لە پەرتوکە نوێکاندا بەلادان ناونابرێت بەڵام وەك پێوەرێك هەرکاتێك زانست و ئایین هاورابوون هەردووکیان ڕاستن گەر بۆچوونەکانیان پێچەوانە بوو بێگومان ئایین ڕاستەو زانست دەبێ بە خۆیدا بچێتەوە ، چونکە وەك هەموومان دەزانین زاست ناویەناو دەگۆرێ هەندێ لە ڕاستیەکانی سەدەی پێشوو ئەمڕۆ زانست بەدرۆی دەخاتەوە بێگومان ئەوەی ئەمرۆش ڕاستە دەشێ سبەینێ بانگەشە بۆ پێچەوانەکەی بکرێ.

### هۆی لادانە سێکسی یەکان :

لەڕاستی دا کۆمەڵێکی زۆر هۆکار هەن هاندەرو پاڵنەری لادانە سێکسی یەکانن و زیاتر لە تیۆرێك هەیە کە ئەم حاڵەتە روون دەکاتەوە و دەشێ هەندێ تیۆر بۆ لادانێکی سێکسی گونجاو بێت بۆ لادانێکی تر ڕاست نەبێ .

### گرنگترین هۆکارەکان بریتی یە لە :

١- ڕازی کردنی سێکسی : بەپێ ی ئەم بۆچوونە بەهۆی دەست نەکەوتنی ڕێگەی سێکسی دروست بۆ بەتاڵ کردنەوەی توانای سێکسی تاك ناچار دەبێت لەگەڵ

بداتــه تاكــەكانی كۆمــەڵ و بەشــێوەیەكی واقیعیانــه مامەڵــه لەگــەڵ كێــشەكاندا بكات و بایەخی تایبەت بداته منداڵ و لاوان و هاندانی بەهرەكانیان .

٣- خۆبــەتاڵ كردنــەوە (Catharsis) ؛ رێگــه بــدرێت ئــەو ئــارەزووە توندوتیژییــەی لــه تاكــدا هەیــه بەشــێوەیەكی تــر دەری ببرێــت كــه زیــانی نــەبێت , واتــه لەبوارێكــەوە بــۆ بــوارێكی تــر . دەبــێ ئــەوەش بــزانین كــه هەنــدێجار خۆبــەتاڵ كردنەوە دەبێته هۆی توندوتیژی زیاتر .

٤- هانــدان بــەوەی بەرامبــەر بــەوازهێنانی لــه هــەر رەفتــارێكی توندوتیــژ هەنــدێ دەســكەوتی بــدەیتێ یــان بەرامبەرجێیــه جێكردنی هــەر رەفتــارێكی خواســتراو بەخششێكی بدەیتێ.

٥- ســزادان (punishment ) ؛ بەســزا دانــی كەســی توندوتیــژ بەشــێوەیەك لــه شــێوەكان ( بەنــد كــردن ,بێبــەش كردنــی لــەخواردن , لەشــتێك كــه پێویــستی پێــی بێت ).

٦- هەســت كــردن بــەئازاری بەرامبــەر لــه كــاتی توندوتیــژی دا، تــاك هەســت بــەئازاری قوربانییەكــەی ناكــات بــەلام گــەر دواتــر دیمەنــەكانی نیــشان بــدرێت رەنگــه هەست بەئازارەكانیان بكات و له ئایندەدا كەمتر توندبێ .

٧- بــەكارهێنانی دەرمــان كــه زیــاتر لــه جۆرێــك بــەكاردەهێنرێت و هەریەكــەیان بــەبرِو شێوەی دیاری كراو.

٨- رۆڵــی راگەیانــدن ؛ راگەیانــدن رۆڵــی بەرچــاوی هەیــه لــه پــەروەردەكردن و پێگەیانــدنی تاكــەكانی كۆمــەڵ ،لــەرۆژگارێكی وەك ئــەمرۆدا رۆڵــی لــه جــاران زیــاترە چــونكه مــاوەی ئــەو كاتانــەی هــەر یــەك لــه ئێمــه لەبــەردەم شاشــەی تەلــەفزیۆن دا بەســەری دەبــەین چــەند هێنــدەی ئــەو كاتانەیــه كــه لەگــەڵ ئەندامانی خێزاندا بەسەری دەبەین .

بۆیــه بــونی راگەیانــدنێكی بــەرپرس و خــەم خــۆر كــارێكی زۆر گرنگــه بۆكەمكردنەوەی توندوتیژی و پێگەیاندنی كۆمەڵە تاكێكی رۆشنبیرو ئاشتی خواز.

# خۆکوژی

# (Suicide)

**مێژووی ئەم دیاردەیە :**

خۆکوشتن لوتکەی تراجیدیای مرۆڤایەتی. بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی ڕەگی داکوتیوە لەلای هۆزە هندییەکانی ئەمەریکای باکور جێی شانازییە خزمەتکارو دیلەکان خۆیان بکوژن پاش مردنی سەرۆکەکەیان. هەروەها لە ئەمەریکای ناوەڕاست پاش مردنی سەرۆك خێل وا پێویست دەکات خێزان وخزم و هاورێیانی سەرۆك خۆیان بکوژن. ئەم شێوازی خۆکوشتنە لای هەندێ هۆزی هیندستانیش باوبووە تاکو سالی (١٩٤٠ )پاش مردنی پیاو ژنەکەی وەکو وەفایەك لەکاتی مەراسیمی بەخاك سپاردندا خۆی دەکوشت.

لەیاپان دا خۆکوشتنی (هامیکازی) باوە کەتاك لە پێناوی رزگار کردنی ژیانی خەلکیدا خۆی بەخت دەکات بۆنمونە لە ئابی (١٩٤٥) داوای خۆبەخشیان کرد بۆ سواربونی بۆمبی گەورە (تۆربید) بۆ لەناوبردنی کەشتی و ژێر دەریاییەکانی دوژمنان ژمارەی خۆبەخشەکان گەیشتە (١٢٢٨ )خۆبەخش وتوانیان (٢٨ )کەشتی ئەمەریکی نوقم بکەن و زیان بە (٢٨٠ )کەشتی تر بگەیەنن .

جۆرێکی تر لە خۆکوشتن بریتییە لە خۆکوشتنی بیرەوەریانە کەمێژوەکەی دەگەرێتەوە بۆئەفسانەی (ساموری )کەبەدرێژایی تەمەنی لە پال درەختێکدا دەژیا پاش ووشك بوونی درەختەکە بریاریدا خۆی بکوژێت تاکو گیانی لەگەل درەختەکەدا یەك بگرێ و پێکەوە بژین هەمان جۆری خۆکوشتن لە هەندێ لە هۆزەکانی ئەسکیمۆدا هەیە ئەویش بە خواردنی خۆلی سەر گۆڕی مردووەکە تاکو دەمرن بەنیازی یەکگرتن .

**ڕەفتاری خۆکوشتن دەکرێت بە پێنج ئاست :**

١- بیری خۆکوشتن : تاك بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بیرلەوەدەکاتەوە کە خۆی بکوژێت بەلام ڕەفتاری خۆکوشتنی نییە.

٢- هەڕەشە کردن بەخۆکوشتن : لەرێی قسەکردن یان نوسینەوە هەڕەشەی خۆکوشتن دەکات بەلام بەکردەوە هیچ ناکات.

٣- ڕەفتاری خۆکوژی: هەڵدەستێت بەهەندێ ڕەفتار دڵنیایە نابێتە هۆی مردن وەکو خواردنی بڕێك دەرمان کە زیاترە لەبری چارەسەر بەلام ناگاتە ئاستی خۆکوشتن.

٤- هەوڵی خۆکوشتن : زیان بەخۆی دەگەیەنێت دەشێ ببێتە هۆی برینی بچوك یان گەورە. وەکو بریندارکردنی چەند شوێنێکی خۆی .

٥- خۆکوشتنی تەواوەتی : کەسەکە بەتەواوی کۆتایی بەژیانی خۆی دێنێت بەهەر ڕێگەیەك بێت سوتان , دەرمان خواردن .

گەمەی خۆکوشتن : هەڵدەستێت بەخواردنی بڕێك دەرمان کەدەگاتە ئاستی بکوژی بەلام دڵنیایە یەکێك فریای دەکەوێ پێش ئەوەی بمرێ گەر فریای نەکەون دەبێتە هۆی مردن.

خۆکوشتنی درێژ خایەن: بریتییە لە خۆکوشتن لەرێی بەکارهێنانی مەی و جگەرە کێشان و ئالوودەبوون بە بەکارهێنانی دەرمان.....

خۆکوشتنی بەکۆمەڵ : لەم حاڵەتەدا کۆمەڵە کەسێك پێکەوە هەڵدەستن بەخۆکوشتن وەکو ئەو تایەفە ئۆغەندییەی لەسەر مەزهەبی کاسۆلیك بوون لەرێی قەشە ( جۆزیف کیبۆتیرد ) وایان دەزانی لەبەرواری ( ١٩٩٩/١٢/٣١ ) قیامەت هەڵئەسێ وا پێویست دەکات خۆیان ئامادە بکەن بۆبەهەشت . لەمارسی ( ٢٠٠٠ ) دا هەمان گروپ ( ٥٣٠ )لاشەیان لەیەکێك لەکەنیسەکانی ( کانونجو )دۆزرایەوە و پاشان گۆری بەکۆمەڵی تر دۆزاریەوە تاکو ژمارەیان گەیشتە زیاتر لە ( ١٠٠٠ )خۆکوژ.

لەساڵی ( ١٩٧٨ )دا شوێن کەوتوانی ( جیم جونز ) ( ٩١٨ )کەسیان خۆیان کوشت بە مادەی سیانید .

## هۆکارە ترسناکەکانی خۆکوشتن:

بێگومان ئەگەری خۆکوشتن لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازی هەیە و کۆمەڵێك هۆکار هەن ئەگەری ئەم ترسناکییە زیاد یان کەم دەکەن ,گرنگترینیان بریتییەلە :

١- ڕەگەز: هەوڵی خۆکوشتن لەمێینەدا زیاترە وەك لە نێرینە بەرێژەی سێ هێندە, خۆکوشتنی تەواوەتی لە نێرینەدا زیاترە وەك لە مێینە بەرێژەی چوار هێندە.

٢- تەمەن : لەهەموو تەمەنێکدا روودەدات, هەرزەکاری و سەرەتای لاوێتی

ترسناکترین قۆناغن، هەروەها لەدوای تەمەنی(٦٥ساڵی ) ئەگەری خۆکوشتن زۆر زیاد دەکات بەتایبەتی لەو پیرانەی کەبەتەنیا دەژین ونەخۆشی درێژخایەنیان هەیەو لەڕابردووی خۆیان ڕازی نین و ئومێدیان بە ئاینندە نەماوە. هیچ تەمەنێك لەدیاردەی خۆکوشتن بەدەرنییە بۆ نمونە لەساڵی (١٩٨٥ )لەوولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ( ٢٧٨منداڵ ) لەنێوان تەمەنی ( ٥ - ١٤ساڵی )خۆیان کوشتوە.

٣- ئایین : گومانی تێدا نییە سەرجەم ئایینەکان پەیامی ژیانیان پێیەو دژی خۆکوشتنن بە پێی ئایینی هندۆسییەکان ئەوەی دەمرێ تەنها لاشەیە، گیان نامرێ.

لەتەوراتدا باس لەوە دەکات کەخواوەند مرۆڤی ئازاد کردوە بۆهەڵبژاردن لەنێوان خواردنی بەری درەختی ئەمری و بەری درەختی زانیاری بۆ زانینی چاکە وخراپە لەگەڵیدا مردن و بەرپرسیارێتی مرۆڤیش زانیاری هەڵبژارد.

لەمەسیحیەتدا باس لەوە دەکات کە هەڵبژاردنی ئەم درەختە هەرەمەکی نەبووە، بەڵکو زەرورییەتێکی مەوزوعیە چونکە مرۆڤ پێویستی بەئازادییەو ئازادیش ئەگەری گوناە کردن دروست دەکات وگوناە کردنیش بنەمایە بۆ مردن بۆیە دەبێ مرۆڤ کار بکات بۆلەناو بردنی گوناهەکانی لەرێی لەناوبردنی مردنەوە.

لەئیسلامدا باس لەحەتمیەتی مردن دەکات و هەموو نەفسێ دەبێ بمرێ هەموو مردنێ بەفرمانی خواوەندە و خۆکوشتنیش گوناهێکی گەورەیە .لە قورئاندا لە سورەتی (النساءئایەتی ژمارە ٢٩ ) ولاتقتلوا انفسكم ان الله كان بكم رحيما ) واتە خۆتان مەکوژن خوا بە بەزەییە بەرامبەرتان.

بە پێی ئەو سەرژمێریانەی کە دورکایم تۆماری کردوون رێژەی خۆکوشتن لە کاسۆلیك دا کەمترە وەك لە پرۆتستانت بۆنمونە : رێژەی خۆکوشتن لە ئیتالیادا (١,٧کەس ) , لەئێرلەندا (٢,٣کەس ) لەئیسپانیا (٥,٩کەس ) بۆ هەر(١٠٠,٠٠٠کەس ) لەم وولاتانەدا مەزهەبی کاسۆلیك بالا دەستە و لە سوید رێژەی خۆکوشتن (١٧,٨کەس ) , لە فەرەنسا (١٥,٨کەس ) لە دانیمارك (٢٣,٢کەس )ە بۆهەر (١٠٠,٠٠٠کەس ) لەم وولاتانەدا مەزهەبی پرۆتستانت بالا دەستە هۆی ئەمەش دەگەرێنێتەوە بۆ ئەوەی مەزهەبی پرۆتستانت تارادەیەکی زیاتر ڕێگە بە ئازادی

تـــاك و فكـــر دهدات. هەنـــدێكى تـــر هۆكارەكـــەى دەگەڕێنێتـــەوە بـــۆ بـــوونى حاڵـــەتى دانپێـــدانانى گونـــاه كـــردن لاى كاسـۆلیك كـــەوا لـــەتاك دەكـــات ئارادەیـــەكى كـــەمتر هەســـت بـــە گونـــاه بكـــات . ئـــەوەش تێبـــینى دەكـــرێ لـــەنێوان بروادارانـــدا كـــەمترە وەك لـــە بـــێ بروایان.

١- بـــارى خێزانـــى : لـــەتاكى رەبەنـــدا زیـــاترە وەك لـــە خـــاوەن خێـــزان بـــەدوو هێنـــدە و لەژن و پیاوى تەلاق دراودا زیاترە وەك لە رەبەن.

٢- وەرزى ســـــاڵ : زۆربـــــەى حالاتـــــەكانى خۆكوشـــــتن لـــــەوەرزى بـــــەهاردا روودەدەن، لەلایـــەكى تـــرەوە نـــەبوونى تیـــشكى خۆردەبێتـــە هـــۆى خـــەمۆكى و ئەگـــەرى زیـــاترى خۆكوشـــتن بۆیـــە لەناوچـــە تاریكـــەكان كـــە زســـتانیان درێـــژە وەكـــو وولاتـــانى سكەندەنافیاو بەشێك لە ئەلاسكا رێژەى خۆكوشتن زیاترە .

٣- كۆمەلایـــەتى و ئـــابوورى: لەهەنـــدێ كۆمەڵگـــەدا( وەكـــو یا پـــان ) خۆكوشـــتن بـــەجۆرێك لـــە ئازایـــەتى دادەنرێـــت بـــۆ چارەســـەركردنى هەنـــدێ كێـــشە، لـــەكاتى هەڵكـــشان و داكـــشانى ئابووریـــدا رێـــژەى خۆكوشـــتن زۆرتـــر دەبـــێو ئـــەوەى جێـــى ســـەر ســـورمانە ســـەرمایە ى زۆر و خـــۆش گـــوزەرانى بـــالا كاریگـــەرى پێـــچەوانەى هەیـــە وەكـــو هـــەژارى و كـــەم دەرامـــەتى لـــێ دێـــت، بـــە پێى هەنـــدێ توێژینـــەوە رێـــژەى بـــەرز بونـــەوەى خۆكوشـــتن لـــە ســـوید دەگەڕێننـــەوە بۆگـــەلێ هۆكـــار یـــەكێ لەوانـــە خـــۆش گـــوزەرانى و رەفاهییەتـــە كـــە بەهۆیـــەوە تـــاك هەســـت بەبـــەتاڵى دەكـــات و بێزاردەبـــێ لـــەژیانێكى رێكوپێـــك و شـــادمان ( خۆكوشـــتنى بێـــزارى ) . دوركـــایم دەڵـــێ: هـــەر كـــاتێ یاســـاكانى وولات ئـــــاوەكى بـــــوون و هـــــاوولاتى نەیـــــدەزانى لەئاینـــــدەدا چـــــى روودەدات دەدات ئەگەرى زیان گەیاندن بەخۆ زۆر دەبێ.

٤- بـــارى سیاســـى : ســـستمى وولات گـــەر دكتاتۆریانـــە بـــێ و ســـتەم لـــەهاوولاتیان بكـــات وا لەتاكـــەكان بكـــات توشـــى بـــێ ئومێـــدى بـــبن وئاســـۆى ئاینـــدەیان لاروون نـــەبێت و نیـــشتمان بـــە بەندیخانەیـــەكى گـــەورە ببیـــنن و رێـــى رادەربـــرینى ئازادیـــان نـــەداتێ بیگومـــان گـــروپ و كۆمـــەڵى جیـــا جیـــا پەیـــدا دەبـــن تاكـــەكان بـــەئاقارێكى تـــردا دەبـــەن و چـــەمكى مـــردن و خۆكوشـــتنى لا ئاســـان دەكـــەن لـــە ژێـــر كۆمـــەڵێ نـــاوى رازاوەدا پـــە یمانى گـــەورە وچـــەوریان دەدەنـــێ وبەرامبـــەر دۆزەخـــى مـــیرى بەهەشـــتیان بۆ ساز دەدەن چ لەم دنیا یان لەودنیا !!

٥- جـــۆرى پیـــشە : هـــەموو جـــۆرە پیـــشەیەك برێـــك ترســـناكى هەیـــە و بـــێ كـــارى لـــە هـــەمووى خـــرا پترە وتێبـــینى كـــراوە رێـــژەى خۆكوشـــتن لـــەنێوان خـــاوەن پیـــشە

بەرزەکانـــــدا کەبەرپرســـــیارێتیان گـــــەورەترە و تایبە تمەنـــــدی کارەکـــــەیان وادەخـــوازێ شـــێوازێکی تایبـــەتیان هـــەبێ لەژیانـــدا ئەگـــەری خۆکوشـــتنیان زیـــاترە لـــە خـــەڵکانی تـــر بـــۆ نمونـــە لـــە پزیـــشکانی ڤێتێرنـــەری و ددانـــدا زیـــاترە وەك لە پیشەکانی تر پاشان دەرمانسازو....

٦- نەخۆشـــییە دەروونییـــەکان : گومـــانی تێـــدا نییـــە کـــە پەیوەندییـــەکی ئاشـــکرا هەیـــە لەنێوان نەخۆشییە دەروونییەکان و خۆکوشتندا :

- خـــەمۆکی : لـــە (٣٠٪ -٧٠٪ )خۆکوشـــتنەکان پەیوەنـــدی هەیـــە بـــە خەمۆکییـــەوەو ســـەرەتای چـــاکبوونەوە بـــە قۆنـــاغێکی ترســـناك دادەنرێـــت بۆیـــە دەبـــێ زۆر ووریـــا بین لەکاتی چارەسەردا زانیاری تەواو بە کەس و کاری نەخۆشەکە بڵێین.
- ســـکیتزۆفرینیا : لـــەماوەی (١٠ســـاڵی) یەکـــەمی نەخۆشـــییەکەدا نزیکـــەی (١٠٪ )یـــان هەوڵی خۆکوشتن دەدات و لە نێوان ئەمانیشدا (٧٥٪) رەبەنن.
- دڵەڕاوکێ : بەنزیکەی (٢٠٪ )ی هەوڵە سەرنەکەوتووەکانی خۆکوشتن دادەنرێت.
- ئـــەو کەســـانەی خـــاوەن کەســـایەتییەکی دژە کۆمـــەڵن (٥٪) یـــان هـــەوڵی خۆکوشـــتن دەدەن.
- ئەوانـــەی لەســـەر مـــەی خواردنـــەوە راهـــاتوون (١٥٪) هـــەوڵی خۆکوشـــتن دەدەن. لە(٨٠٪ )ئەمانەش نێرینەن.

ســـاڵانە لەوولاتـــە یـــەکگرتووەکانی ئەمـــەریکا نزیکـــەی (٣٠٠,٠٠٠کـــەس) دەمـــرن بەهۆی خۆکوشتنەوە واتە هەر(٢٠خولەك) یەکێك خۆی دەکوژێ.

## هۆی خۆکوشتن:

١- هۆکاری کۆمەڵایەتی: بە پێی دورکایم ئەوکەسانە دەکات بە سێ کۆمەڵەوە

- خۆکوشـــتنی خۆویـــستن (ئـــەنانی) : ئـــەو کەســـانەن کە پەیوەنـــدیان بـــە کۆمەڵـــەوە لاوازە و ســـەر بـــەهیچ کۆمـــەڵێك نـــین بۆیـــە رێـــژەی خۆکوشـــتن لـــەنێوان کەســـانی رەبەنـــدا زیـــاترە وەك لـــە خێزانـــدار و لـــە لادێ دا کـــەمترە وەك لـــە شـــار، خێزانی خاوەن منداڵ پارێزراوترە وەك لە خێزانی بێ منداڵ.
- خۆکوشـــتنی خـــۆ بـــەختکردن : ئـــەو کەســـانەن کـــە پەیوەنـــدیان بـــە کۆمەڵـــەوە زۆر تونـــدەو ئامـــادەن لـــە پێنـــاوی خەڵکیـــدا یـــان لـــە پێنـــاوی ســـەرکەوتنی بۆچـــونەکانیان خۆیـــان بـــەخت بکـــەن وەکـــو جـــەنگاوەرەکانی یاپـــان کاتێـــك دژی ئەمـــەریکا دەجـــەنگان و لەمێـــژووی تازەشـــدا گروپـــی (حمـــاس و جیهـــاد ) ســـەر بەهـــەمان کۆمەڵن.

• خۆکوشتنی گێره شوێنی : ئەو کەسانەن کە پەیوەندیان جێگیر نییە وناتوانن لە کاتی گۆڕانکارییەکاندا خۆیان بگونجێنن خێرا ووره بەردەدەن و دەشێ خۆیان بکوژن.

لەکۆمەڵگەی کوردیدا بەهۆی ئەو نائومێدییەی توشی تاك دەبێ بەتایبەتی مێینە لەهەڵبژاردنی هاوسەری ژیانییدا زۆرجارلەلایەن کەس و کارەوە بەزۆر بەشوو دەدرێت یان دەدرێت بەیەکێ کە خۆشی ناوێ یان لەتەمەندا بەباوك یا باپیری کچە دەشێ وا لە مێینە دەکات پەنا بباتە بەر خۆکوشتن بەهەر ڕێگەیەك بێت ،ئەمە لەلایەکەوە بەکارەساتێکی گەورە دەژمێری بۆتاك و خێزان و کۆمەڵگە بەلام لەلایەکی ترەوە عەشقی ئافرەتی کورد بۆ ژیان و دڵسۆزی بۆخۆشەویستەکەی نیشان دەدات.بێگومان ئەمە هاندانێك نییە بۆ خۆکوشتن بەڵکو خوێندنەوەیەکی ترە بۆ خۆکوژی.

٢- هۆکاری دەروونی : بە پێی فرۆید لەناخی تاکدا دوو غەریزە هەیە یەکەمیان غەریزەی بونیاد نانە پێی دەڵێن ( ئیرۆس ) دووەمیان غەریزەی لەناو بردنەو پێی دەڵێن ( ساناتۆس ) هەر کاتێ دووەمیان زاڵ بێت بەسەر ڕەفتاری تاکدا ئەو کەسە ڕەفتاری گێره شوێنانەی دەبێ و لە هەندێ حاڵەتدا تاك لەبری ئەوەی توندوتیژییەکەی ئاڕاستەی دەرەوە بکات ئاڕاستەی ناخی خۆی دەکات و زیان بەخۆی دەگەیەنێت. ئەوەی ئاماژەی ووتنە فرۆید لەژیانی خۆییدا تەنها یەك حاڵەتی خۆکوشتنی وەسف کردوە.

٣- هۆکاری بایۆلۆجی:

• کەمی ئاستی پێنج هایدرۆکسی ئیندۆل ئەمینۆ ئەسید لە کۆی ( ١٦ )لێکۆلینەوە ( ١١ ) یان ئاماژە بەوە دەکەن کە پەیوەندییەکی ڕاستەوانە هەیە لەنێوان کەمی ئاستی ئەم مادەیەو ڕەفتاری خۆکوژیدا.
• بۆماوە : خۆکوشتن لەنێوان هەندێ خێزاندا زیاترە وەك لە هەندێکی تر ,هەروەها لەدووانەی یەك هێلکەدا زیاترە وەك لە دووانەی دووهێلکە بەرێژەی شەش هێندە.

## پەیوەندی نێوان جگەرەکێشان وخۆکوشتن چییە؟

بە پێی توێژینەوەیەك لە گۆڤاری ئەمەریکی بۆ نەخۆشییە دەروونییەکان لە (

نیسانی ۲۰۰۳ )دا لاپەرە (۷۷۲-۷۷۹) دا بڵاوکراوەتەوە, لەسەر (۳٤۷نەخۆش )کراوە, (۱۷٥) یان نەخۆشی خەمۆکیان هەبووە, (۱۲۷) یان نەخۆشی سکیتزۆفرینیا, (٤٥) نەخۆشی تر.

تێبینی کراوە کەسانی جگەرە کێش زیاتر بیری خۆکوژی وەوڵی خۆکوشتنیان هەیە وەك لە کەسانی جگەرە نەکێش هەروەها ڕێژەی توندوتیژی لەنێوان جگەرە کێشاندا زیاترە.

## ڕێگاکانی خۆکوشتن :

لەنێردا .........

خنکاندن ............................................٪۳۸

ژەهراوی بوون بەبەکارهێنانی دەرمان........................٪۲٥

خۆفرمدان( هەڵدان ) لەشوێنی بەرزەوە...........................٪۱۳

ژەهراوی بوون بەمادەی یەکانە ئۆکسیدی کاربۆن.......................٪۹

لەمێینەدا........

ژەهراوی بوون بەبەکارهێنانی دەرمان..........................٪٤۲

خۆخنکاندن.................................................٪۲۲

خۆفرمدان لەشوێنی بەرزەوە....................................٪۱۳

خۆفرمدانە ناو ئاو.............................................٪۸

وەك دەبینین ئەو ڕێگایانەی کە توندترە لەلایەن نێرینەوە زیاتر بەکار دێت .بەڵام لە کۆمەڵگەی خۆماندا مێینە زیاتر پەنادەباتە بەرخۆسوتاندن کە هۆی سەرەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاسانی دەست کەوتنی ئەوت زۆر جار هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی کێشەی کۆمەڵایەتی. ئەوەشمان بیر نەچێ کە خۆسوتاندن مەرج نییە زۆرینەی حاڵەتەکان بێت چونکە بەکارهێنانی دەرمانیش ڕێژەیەکی بەرچاو پێك دێنێ بەڵام لەبەرئەوەی خۆسوتاندن ماکەکانی دەمێنێتەوەو زیاتر هاوولاتیان ئاگاداری دەبن و دەزگاکانی ڕاگەیاندن زیاتر لەسەری دەدوێن وادێتە بەرچاو لە هەمووڕێگەکانی تر زیاتر بێت یان هەندێ جار تاکە ڕێگە بێت.!

### ئایا نەخۆش مافی خۆکوشتنی هەیە ؟

ڕەنگە ئەم پرسیارە تا ڕادەیەك سەیر بێ گەر لەبری ئەوە بلێین ئایا هیچ کەسێ مافی خۆکوشتنی هەیە؟

زانایان لەوەلامی ئەم پرسیارەدا (١٠٠٪) کۆك نین چونکە هەندێ باس لە مافی تاك دەکات و دەڵێ کاتێك خۆکوشتن زیانی بۆ بەرامبەر نەبێ بۆ ڕێگری بکەین و بەرهەڵستی کردن بەجۆرێك لەدەست درێژی دادەنێ بۆسەرمافی تاك !؟

هەموو ئایینەکان خۆکوشتن بەحەرام دادەنێن هەڕەشە لەخۆکوژ دەکەن بەدۆزەخ بەلام گەر مردنەکەی لە پێناوی پاراستنی گیانی هاوڵەکانی بێ و مردنی تاك ڕزگارکەری ژیانی کۆمەڵ بێ کارێکی پیرۆزە و دەست خۆشکەری لێدەکرێ مژدەی بەهەشتی دەدرێتی .

سەبارەت بەوەی لەگەڵ خۆیدا کەسانی تر بکوژێ بەتایبەتی دوژمنان قسەی لەسەرە و هەندێکیان بە کارێکی (استشهادی) ناو دەبەن مژدەی حۆری و بەهەشتی دەدەنێ!

تەنانەت گەر کارە خۆکوژییەکەی ببێتە هۆی مردنی کەسانی بێ تاوان و لەو بە برواتریشی تێدابێت هەرکارێکی پیرۆزەمو خۆکوژ بەهەشتیەو بری دەسکەوتی لە باخی بەهەشت وحۆریان کەم ناکات !؟ کافرەکان بۆ دۆزەخ و بڕوادارەکانیش بۆ بەهەشت؟!

کەواتە مردن هەمیشە کارێکی سلبی نییە ودەکرێ خزمەتی مرۆڤایەتی بکات لە ڕەوانەکردنی خەڵکی بۆ بەهەشت و جەهەنەم ؟!

هەندێکی تریان ئەم جۆرە خۆکوژییە بەحرام دەزانن و بە کارێکی دوور لە دین ناوی دەبەن ؟

هەندێکی تر بە پێی کات و شوێن ڕاستی و ناڕاستی کارەکە دەخەملێنێ دەڵێ کارەکە گونجاوە لە شوێنێکداو نەگونجاوە لە شوێنێکی تر گەر دوژمن هەمان دوژمنیش بێ؟؟!!

لێرەدا ناکرێ باس لەوەلامی ئەو نەگەرانەی سەرەوە بکەین چونکە دەکەوینە کێشمەکێشی ئایینی کەئەوە باسەکەی من نییە .بەلام باس لە نەگەری یەکەم

دمکەین کەتاك ئازادە لە خۆکوشتن گەر مردنی ئەو زیانی بۆکەس نەبێ .

لێرەدا دەپرسین :

ئایا هیچ کەسێك هەیە مردنی ئەو زیانی بۆکەس نەبێ؟

کەس هەیە خێزان , هاورێ , هاونیشتمانی نەبێ ؟

کەس هەیە مردنی ئەو کار لەکەس نەکات؟

کەس هەیە هیچ سودێکی بۆمرۆڤ وئاژەڵ ودرەخت و بێگیانەکان نەبێ؟!

باسکال دەڵێ :خۆکوشتن نیشانەی ئازایەتییە بەڵام تائاستێکی کەم چونکە ژیان کارێکی گران ترە.

ناپلیون بوناپرت دەڵێ : خۆکوشتن ناگونجێ لەگەڵ ئەو پلەو پایەی کە من لەشانۆی ژیاندا هەمە من مرۆڤێکم فرمانم پێ دراوە بژیم.

ئەومان بیر نەچێ کە خۆکوشتن زۆر جار هەڵویستێکی ترسنۆکانەیە بەرامبەر رووداوەکان . هەروەها بیرمان نەچێ دژی رەزامەندی خواوەندە گەر باوەڕمان بەخواهەبێ. بۆیە هیچ کەسێ نییە لەسەر زەویدا مافی خۆکوشتنی هەبێ چونکە ئێمە هەموومان ژیان دروست دەکەین مردنی هەریەکێ مردنێ بەشێکە لە ژیان.

چارەسەر :

بە پێی حاڵەتەکە دەگۆرێت هەرلەوەی هەندێ نەخۆش پێویستی بەخەواندن هەیە لە نەخۆشخانە چارەسەری گونجاوی بۆبکرێ هەندێکی تر دەتوانرێت تەنها لەرێی کلینیکەوە چارەسەری بۆبکرێت بە پێی ئەو پێنج ئاستەی کەباسمان کرد بۆ رەفتاری خۆکوژی بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین رەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین

١- خەواندنی لەنەخۆشخانە .

٢- بەکارهێنانی دەرمان بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشییەکەی گەر نەخۆش بوو دەبێت ئەوە بزانین کە پێویستە دەرمان بەبرێکی کەم بدەینە نەخۆش و ئاگاداری کەس و کاری نەخۆش بکەین خۆیان دەرمانەکەی بدەنێ و دەرمان لای نەخۆش دانەنرێت . هەروەها لە هەندێ حاڵەتدا وەکو سەرەتای چاك بوونەوە لە نەخۆشی خەمۆکی کاتێکی ترسناکە بۆ هەوڵی خۆکوشتن چونکە دەشێ ئەو پیلانەی نەخۆش دایناوە بۆ خۆکوشتن لەکاتی نەخۆشییەکەدا نەتوانێ جێبەجێی بکات بە هۆی کەمی توانەوە پاشان لەو کاتەدا کە برێك هێزی بۆ

دەگەرێتەوە هەڵدەستێت بەجێ بەجێ کردنی.

٣- چاودێری کردنی نەخۆش ؛ گەر لەنەخۆشخانە بوو لەلایەن پزیشك و کارمەندانی تەندروستی و یاوەری نەخۆشەوە . پشکنینی نەخۆش و لێسەندنی هەرنامێرێك ترسناکی لەسەر گیانی نەخۆش پەیدا بکات وەکو چەقۆ و دەرنەفیز و دەرمان . هتد... گەرلەماڵەوەش بوو لەلایەن کەس وکاری نەخۆشەوە ، بەجێ نەهێشتنی نەخۆش بەتەنیا لەژوورێکدا و دوور خستنەوەی هەر شتێك ئەگەری بەکارهێنانی هەبێ لەلایەن نەخۆشەوە بۆخۆکوشتن وەکوچەقۆ یا هەرنامێریکی تیژی ترو گوریس و نەوت وسەرچاوەی ئاگرو دەرمان و ....

٤- رۆڵی گرنگی توێژەرەوەی کۆمەڵایەتی لە کاتی چارەسەردا گەر بەهۆی کێشەی کۆمەڵایەتییەوە هەوڵی خۆکوشتن بدات . لەکۆمەڵگەی خۆماندا ئەمە رێژەیەکی بەرچاوی حاڵەتەکان پێك دێنێ.

٥- رۆڵی گرنگی چارەسازی دەروونی لەکاتی چارەسەردا.بەتایبەتی گەر هۆکاری خۆکوشتنەکە بگەرێتەوە بۆ بوونی ئەو نەخۆشیانەی کە دەتوانرێت لەرێی چارەسازی دەروونییەوە سودی پێ بگەیەنرێت.

٦- بەکارهێنانی تەزووی کارەبا بۆچارەسەر کردنی هەندێ حاڵەتی تایبەت لەبەکارهێنانی دەرمان باشترەو ئەنجامی خێراتری دەبێت.

## دوانزە خاڵی گرنگ زەنگی خۆکوشتن لێدەدات :

١- بوونی پلانێکی روون سەبارەت بە خۆکوشتن ( بیر کردنەوە لێی یان گفتوگۆکردن ) سەبارەت بەو بابەتە.

٢- هەستان بەو چالاکیانەی ئاماژە بەخشن بۆخۆکوژی وەکو ماڵئاوایی کردن و نوسینی وەسیەت نامە و داواکردن لە هاورێیەکی یان یەکێك لە ئەندامانی ماڵەوە بۆشتن.

٣- بوونی دیاردەی خۆکوژی لەو خێزانەدا یان هاورێیەکی بەم نزیکانە خۆی کوشتبێ.

٤- بوونی کەرەسەی خۆکوشتن لەماڵدا وەکو دەمانچە و برێکی زۆر دەرمان .

٥- ئالودەبێت لەسەربەکارهێنانی دەرمان و مادەبێهۆشکەرەکان.

٦- لەدەست دانی کەس و کار بەتایبەتی کەس وکاری پلە یەك , لەدەست دانی

سەرەت و سامان و کاروپیشە.....

٧- نەخۆش بەتەنیا بژی یان گۆشە گیر بێت .

٨- خەمۆکی کە هاوەڵ بێت لەگەڵ بێ ئومێدی باوەڕنەبوون بەچاك بوونەوە.

٩- بونی هەڵوەسەی بیستن فرمانی خراپ بەنەخۆش بڵێت.

١٠- تازە لە نەخۆشخانەی دەروونی چارەسەری بۆکرابێت و نێردرابێتە ماڵەوە.

١١- دڵەراوکێ بە هەموو جۆرەکانییەوە ئەگەری خۆکوشتن زیاد دەکات.

١٢- هەست کردنی پزیشك بەحاڵەتی نەخۆش سەرەڕای ئەوەی نەخۆش دەیڵی یان دەیکات گەرئەو هەستەت بۆ دروست بوو نەخۆش بەنیازی خۆکوشتنە دەبێ کاری پێویستی بۆبکەیت و لەگەڵ کەسوکاری نەخۆشدا گفت وگۆبکەیت .

## پەیامەکانی مرۆڤ کە ئاماژەن بە خۆکوشتن:

١- پەیامی ڕاستەوخۆی زارەکی: بەشێوەی ڕاستەوخۆ بە چواردەور دەڵێ ﴿خۆم دەکوژم – فلان شتم بۆ نەکەن خۆم دەکوژم – لەداخی تۆ خۆم دەکوژم﴾.

٢- پەیامی ناڕاستەوخۆی زارەکی: ماوەیەك پێش هەوڵی خۆکوشتن چەند وتەیەك دەردەبرێت کە ئاماژەن بە بێزاری و نائومێدی وەکو ﴿ کەی ئەمە ژیانە، مردن خۆشترە لە ژیان، ئەگەر جارێکی تر یەکمان بینییەوە﴾.

٣- پەیامی ڕاستەوخۆی نازارەکی: بەشێوازی کرداری ئاماژە دەدات بە چواردەوری کە بە نیازی خۆکوشتنە وەکو پەیداکردنی چەك، کۆکردنەوەی حەب، کڕین و پەیداکردنی مادەی ژەهراوی، ئامادەکردنی نەوت یا بەنزین ......﴾.

٤- پەیامی ناڕاستەوخۆی نازارەکی: ماوەیەك پێش هەوڵی خۆکەوشتن هەڵدەستێت بەرێکخستنی شتە تایبەتیەکانی خۆی وەکو شتی ناوماڵ، قەرزدانەوە یان بەخشینی شتەکانی خۆی. پێشتر کەسێکی گۆشەگیربووە بەلام لەو ماوەیەدا سەردانی زوربەی خزم و کەسوکار و هاورێکانی دەکات، وەکو خواحافیزی کردنێك لێیان.

# نهێنی پارێزی

# Confidentiality

نهێنی پارێزی یەکێکە لە ئەرکە گرنگ و پیرۆزەکانی پزیشك لە هەمان کاتدا یەکێکە لە مافە بنەرەتیەکانی نەخۆش ، بۆیە پێویستە لەسەر پزیشك بەم ئەرکەی هەڵسێ لە لایەك وەکو ڕێزگرتنێك لە مافی نەخۆش ،لە لایەکی ئەو سودانەی لەو نهێنی پاراستنە دەکەونەوە هەروەها بەبێ پاراستنی نهێنی نەخۆش ئامادەنیە کێشەو خواستەکانی خۆی بۆ پزیشك باس بکات دیارە ئەمەش کاردەکاتە سەر توانای دەست نیشانکردنی نەخۆشیەکە.

**لێرە واباشە بە شێوەی پرسیار و وەڵام باس لەم بابەتە بکەین:**

**پ/ لە چ بارێکدا نهێنیەکان ئاشکرا دەکرێ؟**

- تاك خۆی ڕێگە بدات بە پزیشك بۆ باسکردنی حاڵەتەکەی.
- دادگا داوای زانیاری بکات چ دادگای شارستانی بێت یان دادگای سەربازی.
- بەرپرسیارێتی بەرامبەر بە کۆمەڵگە لە سەرو بەرژەوەندی تاکەوەیە.

**پ/ ڕێپێدانی تاك چۆن دەبێت واتە مەبەست لەو ڕێپێدانە چیە؟**

- بەشێوەیەکی ڕەسمی ( فەرمی ) بێت.
- بواری هەڵبژاردنی هەبێت واتە مەبەستێك هەبێت لەوەی داوای دەکات.

**ئەم ڕەزامەندیەش بە دوو جۆرە:**

١- ئاشکرا: واتە بە نوسین لە کاتی نەشتەرگەری یان بێهۆشکاری.

٢- واتایی: بە هەڵسوکەوتی تاکدا دەردەکەوێت وەکو هەڵکردنی قۆڵی کراس کاتێ داوا لەنەخۆش دەکەیت فشاری خوێنی بۆ بپێویت. خۆ ئامادەکردنی کاتی دەرزی لێدان.

**پ/ مافی خێزان لە زانینی حاڵەتەکە و مافی کەسوکاری تر؟**

بێگومان تاك لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ئەندامێکە لە خێزان و زانینی حاڵەتەکەی لەلایەن خێزانەوە وا دەکات زیاتر هاوکاری بکەن لە پرۆسەی چارەسەردا و باشترکردنی ئایندەی تاك بەڵام ئەمە بیانویەك نیە بۆ پێشێل کردنی نهێنی

پـــارێزی گــەر تـــاك خـــۆی ڕازی نـــەبێت خێـــزان مـــافی ئـــەوەی نیـــە بـــەزۆر زانیـــاری وەرگرێـــت.مەگـــەر لـــە حاڵەتێكـــدا ژیـــانی یـــەكێك یـــان زیـــاتر لـــە ئەنـــدامانی خێـــزان لـــە مەترسیدا بێت.

پ/ ئایا پاش مردنی تاك ئەركی نهێنی پارێزی كۆتایی دێت؟

بێگومـــان نـــەخێر بەتایبـــەتی گـــەر ئـــەو زانیاریانـــە زیـــان بـــە نـــاو شـــۆرەتی ئـــەو كەســـە بگەیەنێت، پزیـــشك دەبێـــت بارەكـــە هەڵـــسەنگێنێ ئایـــا ئاشـــكرا كردنـــی ئـــەو زانیاریانـــە هیچ سودێك بەو خێزانە یان ئەو بنەماڵەیە دەگەیەنێت.

پ/ ئایا هەمیشە دادگا مافی ئەوەی هەیە داوای زانیاری لە پزیشك بكات؟

گـــەر نەخۆشـــەكە هـــەر گرفتێكـــی یاســـایی هـــەبێت كـــە لـــە ڕێـــی دادگـــاوە یـــەكالایی بكرێتـــەوە مـــافی ئـــەوەی هەیـــە داوای زانیـــاری لـــە پزیـــشك بكـــات بـــەلام لـــە هـــەمان كاتـــدا پزیـــشك مـــافی ئـــەوەی هەیـــە ئـــەو زانیاریانـــەی زۆر تایبـــەتن تـــەنها لـــە دانیـــشتنی داخراوی دادگادا باسیان لێوە بكات.

پ/ ئـــەو حاڵەتانـــە چـــین كـــە پزیـــشك بـــە بـــێ ڕەزامەنـــدی نـــەخۆش دەتوانێـــت نهێنـــی بدركێنێت؟

- كـــاتێ تـــاكی ســـێهەم لـــە مەترســـیدا بێـــت وەكـــو ئـــەوەی نەخۆشـــێك دەڵـــێ بـــە نیـــازم خێزانەكـــەم یـــان فلانـــە كـــەس بكـــوژم جـــا بـــەهۆی نەخۆشـــیەوە بێـــت یـــان لـــە ژێـــر كاریگەری مادەهۆشبەرەكان بێت .
- كاتێك شاردنەوەی زانیاری ببێتە ڕێگر لەبەردەم كارەكانی پۆلیسدا.
- كـــاتێ پزیـــشك لـــەو بـــاوەڕەدا بێـــت ئـــەو تاكـــە ناتوانێـــت كارەكـــەی ئـــە نجام بـــدات و مەترسی بۆ دەوروبەر دروست دەكات.
- كاتێ ئەو تاكە نەتوانێت ئۆتۆمۆبیل لیبخورێت و داوای مۆڵەت دەكات.
- كـــاتێ منـــداڵ دەســـتدرێژی دەكرێتـــە ســـەر لـــە لایـــەن كەســـێكی گـــەورەوە لـــە ئەنـــدامانی خێـــزان یـــان كەســـانی تـــرەوە منـــداڵ نایـــەوێت كەســـوكاری بزانێـــت.بـــەلام مەترســـی بـــۆ خۆیی و ئەندامانی تری خێزان هەیە.
- كاتێ باری نەخۆشیەكە وا پێویست دەكات كەسوكاری نەخۆش هاوكار بن.

پ/ ئـــەو خالانـــەی چـــین كـــەدەبێت پزیـــشك ڕەچـــاویان بكـــات لـــە كاتێكـــدا بـــە نیـــازە

نهێنی نەخۆشێك بدركێنێت چین؟

- مەترسی دركاند و نەدركاندن.
- سودەكانی دركاندی ئەو نهێنیە.
- هەستەوەری ئەو زانیاریانەی داوادەكرێن.
- ئەو بازنەیەی زانیاریەكان تێیدا بڵاودەبێتەوە.
- وا پێویست دەكات بارەكە بەشێوەی شوبهاندن لەگەڵ چەند پزیشكێكی تردا باس بكات تاكو بۆچوونی زیاتر لەكەسێك وەرگرێت.

پ/ وێنەگرتن بە كامێرا ، ڤیدیۆ بۆ مەبەستی فێركردن تا چەند شتێكی دروستە یان ڕێگە پێدراوە؟

هەمومان دەزانین فێربوون كارێكی گرنگەو ئەركی سەرشانی مامۆستاكانە خوێندكارەكانیان فێری زانست بكەن بەلام نابێت ئەم كارە ببێتە هۆی دەست درێژی كردنە سەر مافی نەخۆش و پێشێلكردنی مافەكانی نەخۆش. بۆیە دەبێت ئەم خاڵانە لەگەڵ نەخۆشدا باس بكرێت:

- رەزامەندی نەخۆش بۆ وێنەگرتنەكە و مەبەست لەو كارە چیە.
- پێدانی زانیاری تەواو بە نەخۆش و كەس وكاری سەبارەت بەم كارە.
- دڵنیابوون لەوەی نەخۆش لە ژێر فشاردا ئەو رەزامەندیە ناداتە تۆ كە بەداخەوە زۆربەی كات نەخۆش لە ترسا رەزامەندی دەنوێنێ وای بۆ دەچێت یان وا ئاماژەی دەدرێتی گەر رەزامەند نەبێ لە هەندێ لە خزمەتگوزاریە تەندروستیەكان بێبەش دەبێت.
- هەركاتێ نەخۆش داوایكرد وێنەگرتن راگرە.
- نابێت بەشداری پێبكرێت لە هیچ چالاكیەك بەبێ رەزامەندی نەخۆش بەدەر لەو مەبەستەی لە سەرەتادا وێنەكەی بۆ گیراوە.
- دڵنیابە لەوەی ئەو شێوازی وێنەگرتنە كەرامەت و تایبەتمەندی ئەو تاكە لە كەدار ناكات.
- لە شوێنی تایبەتدا هەڵبگیرێت و دوور بێت لە دەستی كەسانی تر و ڕێگە نەدرێت بە كەسانێك كە ئەو رەزامەندیە نایان گرێتەوە تەماشای ئەو

# مافەکانی نەخۆش

## Patient rights

١- مافی خۆتە لە شوێنێکی تایبەت و بەڕێزەوە ببینرێت.

٢- مافی خۆتە هەموو ڕاستیەکان سەبارەت بە ڕێگەکانی چارەسەر بزانیت سوود و ماکەکانی هەر یەکەیان.

٣- مافی خۆتە هەموو پرسیای بکەی لەمەر ئێستا و ئایندەی حاڵەتەکەت .

٤- مافەی خۆتە ناوی سەرجەم ئەو ستافە بزانیت کە چارەسەرت بۆ دەکەن لە نەخۆشخانە.

٥- مافی خۆتە ڕەزامەند بیت لەسەر چارەسەرکردن وەك چۆن مافی خۆتە چارەسەر ڕەتبکەیتەوە .

٦- مافی خۆتە بە تەنیا لەگەڵ پزیشکەکەتدا قسە بکەیت و داوا بکەی نەخۆشەکانی تر بچنە دەرێ یان کەسوکارت بچنە دەرێ هەر پزیشکێ ئەو داواکاریەکەت جێبەجێ نەکات ئەوە دەستدرێژی کردۆتە سەر مافەکانت بۆت هەیە هەڵوێستی شیاو وەرگریت.

٧- مافی خۆتە داوای ڕاپۆرتی پزیشکی بکەیت لەمەر نەخۆشیەکەت یان گەر ڕاپۆرتیان بۆ نوسیت بزانیت چی نوسراوە.بەهەر زمانێك بێت.

٨- مافی خۆتە ڕازی بیت یان نا لە بەشداری کردن لە توێژینەوە.

٩- مافی خۆتە کە ڕێگە نەدەیت خوێندکار بتبینێت چونکە نەخۆشخانەکانی ئێمە تایبەتن بە وەزارەتی تەندروستی نەك وەزارەتی خوێندنی باڵا.

١٠- مافی خۆتە کە خۆت یان کەسوکارت یان یاوەرت کە هەڵەیەکتان بینی ئاگاداری پزیشك بکەینەوە.

١١- پزیشك دادوەر نیە مافی نیە سزای تۆ بدات لەسەر ڕەفتارەکانت کاتێك هەڵەیەکت کردبێ بۆی نیە سەرزەنشتت بکات بەڵام بۆی هەیە پرسیار بکات.

١٢- ئەو پرسیارانەی کە زۆر تایبەتن مافی خۆتە وەڵام نەدەیتەوە و کار ناکاتە سەر چاسەرکردنت. پزیشك بۆی نیە بەزۆر زانیاریت لێوەرگرێت یان پێت بڵێ گەر پێم نەڵێی فلانە شتت بۆ ناکەم یان فلانە پشکنینت بۆ ئەنجان نادەم.

١٣- مافی خۆتە کاتی پێویستت هەبێت بۆ باسکردنی کێشەکەت (٧٠٪ پزیشکان لەماوەی کەمتر لە ١٨ چرکەدا قسە بە نەخۆش دەبڕن ) ئەمە گەر ڕێگەی بدەن قسە بکات.

١٤- مافی خۆتە بڕوانیتە فایلەکەت و بزانیت جی تیا نوسراوە گەر بە زمانێك بوو کە نەتئەزانی مافی

خۆته داوابكەی بۆت وەربگێرێته سەرنەو زمانەی كە تێی دەگەیت بە وەرگێرانی زارەكی نەك نوسین.

١٥- مافە خۆتە داوای پاراستنی نهێنیەكانت بكەیت لە زانیاری و جۆری نەخۆشی بەبێ رەزامەنی تۆ نابێت بەكەس بوترێت.

١٦- مافی خۆتە رێگە نەدەیت بە وێنەگرتنت لە لایەن پزیشك ، كارمەندی تەندروستی ، خوێندكار بۆ هەر مەبەستێك بێت.

١٧- زانینی جۆر و مەبەستی پشكنینەكان .

## بەرپرسیارێتیەكانی نەخۆش :

١- ووتنی راستیەكان سەبارەت بە نەخۆشیەكە. لە ئێستاو رابردوودا.

٢- ناوی ئەو دەرمانانەی وەریدەگریت.

٣- پەیرەوی كردنی رێنماییەكان.

٤- ئاگاداركردنەوەی پزیشك لەكاتی وەرگرتنەوەی ئەنجامی پشكنینەكان.

٥- ئاگاداركردنەوەی پزیشك و كارمەند لەكاتی تێنەگەشتن لە چۆنێتی بەكارهێنانی چارەسەر.

٦- هەلگرتنی بەرپرسیارێتی گەر رازی نەبووی بە چارەسەركردن یان نەشتەرگەری.

٧- رێزگرتنی مافی نەخۆشەكانی تر لە دەنگە دەنگ و ژمارەی سەردانەكان و ژمارەی ئەوانەی سەردانت دەكەن.

٨- رێزگرتنی یاساكانی نەخۆشخانە وەكو جگەرە نەكێشان و بەكارنەهێنانی مۆبایل لەو شوێنانەی كە قەدەغەیە.

٩- تاییە تمەندی كەسانی تر راگرە بیرت بێ ئازادی تۆ كۆتای دێت كاتێ مافی تاكەكانی تر دەست پێ دەكات.

١٠- هەر گۆرانكاریەك لە حالەتەكەت روی دا ئاگاداری پزیشك یان كارمەندی تەندروستی بكەرەوە.

# پێڕست


پێشکەشە ........ ١

بەشی یەکەم: ........ ٦

دەستپێك و ڕاستکردنەوەی چەند بۆچونێکی هەڵە ........ ٧

بەشی دووەم: ........ ١٨

پێناسەی تەندروستی دەرونی ........ ١٩

هەندێ چەك هەیە لەمەر پێناسەی تەندروستی دەرونی دەتوانین بەکورتی باسی بکەین ........ ١٩

پۆلێن کردنی نەخۆشیە دەرونیەکان ........ ٢١

بە شێوەیەکی سەرەکی دوو جۆر پۆلێن کردن هەیە: ........ ٢١

هۆکاری پەشێویەکان دەروونییەکان ........ ٢٥

بەشی سێیەم: ........ ٣١

لە نێوان جەستە و دەرونـدا ........ ٣٢

یەکەم: کاریگەری جەستە لەسەر دەرون: ........ ٣٢

دووەم : کاریگەری شلەژانە دەرونیەکان لەسەر جەستە: ........ ٣٣

بەشی چوارەم: ........ ٣٥

پەشێوی مەزاج ........ ٣٦

هۆکارەکانی پەشێوی مەزاج: (Causes) ........ ٣٧

خەمۆکی: ........ ٣٨

نیشانەکانی شادیبوون: ........ ٤٠

پۆلێن کردنی پەشێویەکانی مەزاج: ........ ٤١

چارەسەرکردن (Treatment) : ........................................ ٤٢

ئایندەی نەخۆش (Prognosis) : ........................................ ٤٢

بەشی پێنجەم: ........................................ ٤٤

سکیزۆفرینیـــا ........................................ ٤٥

هۆکاری توشبوون بە سکیزۆفینیا: ........................................ ٤٥

پۆلێن کردنی سکیزۆفرینیا: ........................................ ٤٨

نیشانەکانی سکیزۆفرینیا: ........................................ ٤٩

مەرجەکانی دەست نیشان کردن: ........................................ ٥٣

چارەسەرکردن: ........................................ ٥٤

ماکەکانی سکیزۆفرینیا: ........................................ ٥٦

ئایندەی نەخۆش: ........................................ ٥٨

بەشی شەشەم: ........................................ ٦٠

پەشێوی دڵەراوکێ ........................................ ٦١

دڵەراوکێی گشتی ........................................ ٦٢

نیشانەکانی: ........................................ ٦٢

هۆکارەکان: ........................................ ٦٤

چارەسەرکردن: ........................................ ٦٥

حاڵەتی تۆقین ........................................ ٦٧

چارەسەر: ........................................ ٦٨

ترسی کۆمەڵایەتی ........................................ ٦٩

هۆکاری ئەم حاڵەتە: ........................................ ٦٩

نیشانەکانی : ........................................ ٦٩

چارەسەر: ........................................ ٧٠

ماکەکانی نەخۆشیەکە: ........................................ ٧٠

ترسی تایبەت (دیاریکراو) یان ترسی سادە ........................................ ٧٢

هۆکاری ئەم حاڵەتە: ........................................ ٧٢

جۆرەکانی: ........................................ ٧٢

ئەگۆرەفۆبیا ........................................ ٧٤

واسواسی (هەمەلی) ........................................ ٧٥

هۆکاری ئەم حاڵەتە: ........................................ ٧٦

چارەسەر: ........................................ ٧٦

ئایندەی تاک: ........................................ ٧٧

ئەو هۆکارانەی ئایندەی تاک خراپ دەکەن: ........................................ ٧٧

پەیامەکان بۆ تاك و خێزان: ........................................ ٧٨

پەشێوی پاش زەبری دەروونی ........................................ ٧٩

هەموو برینێك بینراو نیە: ........................................ ٧٩

نیشانەکانی : ........................................ ٧٩

جۆرەکان: ........................................ ٨١

هەندێ هۆکاری تر هەن وا دەکەن حاڵەتەکە خراپتر بێت گرنگترینیان: ........................................ ٨٢

چارەسەر: ........................................ ٨٣

بەشی حەوتەم:........................................................ ٨٥

تێکچوونی کەسێتیتێکچوونی کەسێتی........................................ ٨٥

تێکچوونی کەسێتی........................................................ ٨٦

پۆلێنکردنی تێکچوونی کەسێتی.............................................. ٨٧

کۆمەڵەی گوماناوی: ....................................................... ٨٧

کۆمەڵەی دڵەراوکێ: ....................................................... ٩٠

هۆکاری توشبوون: ........................................................ ٩٢

چارەسەر.................................................................. ٩٣

ئایندەی تاك............................................................... ٩٤

بەشی هەشتەم:........................................................... ٩٥

ئەلکحول و مادەهۆشبەرەکانئەلکحول و مادە هۆشبەرەکان.................. ٩٥

ئەلکحول و مادە هۆشبەرەکان............................................... ٩٦

چەند پێناسەیەك:.......................................................... ٩٦

پۆلێن کردنی مژادەکان ...................................................... ٩٩

ئەلکحول .................................................................. ١٠٠

جۆرەکانی ئاڵوودە بوون : .................................................. ١٠٠

هۆکاری ئاڵوودەبوون:...................................................... ١٠١

زیانەکانی خواردنەوە:...................................................... ١٠٢

هەڵسەنگاندن.............................................................. ١٠٨

ئایندەی تاك:............................................................... ١٠٩

چارەسەر................ ١٠٩
مادە هۆشبەرەکان ................ ١١٢
هێورکەرەوەکان و دژە دڵەراوکێیەکان ................ ١١٤
وروژێنەرەکانی کۆئەندامی دەمار ................ ١١٥
هەڵوسینۆجینەکان (ئەوانەی هەڵوسە دروست دەکەن) ................ ١١٥
کانابیز(حەشیش) ماریجوانا (ماریوانا)................ ١١٦
ئۆپیەیدەکان ................ ١١٦
نیشانەکانی لێگرتنەوە:................ ١١٨
هەڵمژەکان ................ ١١٩
دژە کۆلینێرجیك................ ١١٩
هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر ئەلکحول و مادە هۆشبەرەکان................ ١٢٠
بەشی نۆیەم: ................ ١٢٤
گرفتەکانی خەو ................ ١٢٥
چەند ڕاستیەك سەبارەت بە خەو: ................ ١٢٦
گرفتەکانی خەو ( پەشێویەکانی خەو): ................ ١٢٧
بێخەوی................ ١٢٨
وەستانی هەناسە لەکاتی خەودا ................ ١٣٠
برۆکسیزم (لێکخشانی ددانەکان)................ ١٣١
زۆرخەوی ................ ١٣٢
ڕۆیشتن بەدەم خەوەوە................ ١٣٣

ناخاوتن بەدەم خەوەوە: .......... ١٣٤
خەوی بەزۆر .......... ١٣٥
نیشانەی بێ ئۆقرەیی پەلەکان .......... ١٣٧
دێومەزمە یان مۆتەکە و خەوی ترسناك .......... ١٣٨
هەندێ رێنمایی بۆ خەوێکی دروست: .......... ١٣٨
بەشی دەیەم: .......... ١٤٠
گرفتەکانی خواردن .......... ١٤١
گرنگترین گرفتەکانی خواردن: .......... ١٤٢
نەخواردنی دەماری .......... ١٤٣
دەست نیشانکردن: .......... ١٤٣
هۆکاری ئەم حاڵەتە: .......... ١٤٤
رێژەی بونی حاڵەکە: .......... ١٤٥
چارەسەر: .......... ١٤٥
فرەخواردنی دەماری .......... ١٤٧
نیشانەکان و ماکەکان: .......... ١٤٧
چارەسەر: .......... ١٤٧
بەشی یانزەیەم: .......... ١٤٩
پەشێویە دەرونیەکان لە منداڵدا .......... ١٥٠
ئۆتیزم ( خود تەنهایی ) .......... ١٥١
هۆکاری ئۆتیزم: .......... ١٥١

ئۆتیزم سەر بەکۆمەڵێك یان شەپەنگێك نەخۆشیە کە کرێن بە پێنج جۆرەوە:........ ١٥٣
پۆلێنکردنی ئۆتیزم: ........ ١٥٣
وەڵامی چەند پرسیارێك : ........ ١٥٣
چارەسەر: ........ ١٥٧
ئەمانەی خوارەوەش هەندێ رێنمایین بۆ خێزانەکان: ........ ١٥٨
پەشێوی کەمی هۆشپێدان و فرەجوڵەیی........ ١٦٠
نیشانەکانی ........ ١٦١
نیشانەکانی پشووکورتی ( هەڵەشەیی )........ ١٦٢
جۆرەکانی: ........ ١٦٣
چارەسەر: ........ ١٦٣
بیرکۆڵی ﴿ گرفتی فێربوون﴾........ ١٦٥
زیرەکی و تەمەن:........ ١٦٦
ئاستەکانی بیرکۆڵی: ........ ١٦٧
هۆکاری بیرکۆڵی:........ ١٦٨
چارەسەر: ........ ١٦٩
خۆتەرکردن........ ١٧١
نیشانە کلینیکیەکان:........ ١٧١
هۆکاری خۆ تەرکردن:........ ١٧٢
چارەسەر: ........ ١٧٣
دەستدرێژی بۆ سەر منداڵ ( خراپ هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵ)........ ١٧٥

ئەم خراپ هەڵسوکەوت کردنە بە گەلێك شێوە دەبێت: ............ ١٧٥
ئەو نیشانانەی کە ئاماژە بەخشن بە دەستدرێژی جەستەیی: ............ ١٧٥
ئەو نیشانانەی کە ئاماژە بەخشن بۆ پشت گوێ خستنی جەستەیی: ............ ١٧٥
ئەو نیشانانەی کە ئاماژە بەخشن بە دواکەوتنی گەشە کە هۆکەی جەستەیی نیە: ............ ١٧٥
ئەو نیشانانەی کە ئاماژە بەخشن بە پشت گوێ خستنی سۆزداری: ............ ١٧٦
ئەو نیشانانەی ئاماژە بەخشن بە دەست درێژی سێکسی: ............ ١٧٦
چارەسەر: ............ ١٧٧
بەشی دوانزەیەم: ............ ١٧٨
پەشێویەکانی پاش منداڵبوون ............ ١٧٩
دەتوانین ئەو پەشێوی و حاڵەتانە بکەین بە چوار جۆرەوە: ............ ١٧٩
چارەسەر: ............ ١٧٩
نیشانەکانی: ............ ١٨٠
ئەگەری ئەم حاڵەتە زیاترە لەوانەی: ............ ١٨٠
چارەسەر: ............ ١٨٠
ئایندەی حاڵەتەکە: ............ ١٨١
نیشانەکان: ............ ١٨١
چارەسەر: ............ ١٨٢
بەشی سیانزەیەم: ............ ١٨٣
پەشێویەکانی سێکس ............ ١٨٤
قۆناغەکانی وورووژاندنی سێکسی لای نێرو مێ: ............ ١٨٤

لادانه سیکسی یەکان.......... ۱۸۷
هۆی لادانه سیکسی یەکان :.......... ۱۸۷
گرنگترین هۆکارەکان بریتی یه له :.......... ۱۸۷
جۆرەکانی لادانی سێکسی :.......... ۱۸۹
ئاو هێنانەوه بەدەست.......... ۱۹۷
زیانەکان بریتین له :.......... ۱۹۸
سوودەکانی :.......... ۱۹۹
فڕاندن (اغتصاب).......... ۲۰۰
چارەسەری لادانه سێکسی یەکان :.......... ۲۰۱
ساردی سێکسی.......... ۲۰۳
دەست درێژی سێکسی.......... ۲۰۵
بەشی چواردەیەم:.......... ۲۱۰
چارەسەری دەرونی.......... ۲۱۱
جۆرەکانی چارەسەری دەرونی:.......... ۲۱۱
کام ڕێگەیان باشه و چۆن بریار دەدرێت لەسەری:.......... ۲۱۲
جۆرەکانی چارەسەری دەرونی:.......... ۲۱۳
تێبینی:.......... ۲۱۵
دەرمان و چەند تێبینیەك.......... ۲۱۷
هەندێ ڕاستی لەمەر دەرمانه دەرونەکان:.......... ۲۱۷
گروپه سەرەکیەکانی دەرمان:.......... ۲۱۸

هەندێ کاریگەری لاوەکی دژەخەمۆکی و دژەسایکۆسسك........ ٢٢٠
تێبینی:........ ٢٢٢
چارەسەرکردن بەتەزووی کارەبا........ ٢٢٤
چۆنێتی دانانی هەردوو جەمسەری تەزووەکە :........ ٢٢٥
چۆن دەزانین نەخۆشەکە فێی لێهاتووە :........ ٢٢٥
چەند جار تەزووی کارەبا بەکاردەهێنرێت :........ ٢٢٦
چۆنێتی کارکردنی:........ ٢٢٧
سودەکانی بەکارهێنانی :........ ٢٢٧
کاریگەریە لابەلاییەکانی چارەسەرکردن بەتەزووی کارەبا:........ ٢٢٨
مافەکانی نەخۆش :........ ٢٣٠
تێبینی:........ ٢٣١
بەشی پانزەیەم........ ٢٣٢
پەرکەم........ ٢٣٣
پۆلینکردن:........ ٢٣٣
یەکەم: ئەوانەی بورانەی تەواوەتیان لەگەڵدایە واتە لە هۆشخۆدەچن:........ ٢٣٣
دووەم: ئەوانەی بە تەواوی نابورێنەوە........ ٢٣٤
هۆکاری پەرکەم:........ ٢٣٥
ئەو هۆکارانەی کە هاندەرن بۆ فێلێهاتن:........ ٢٣٦
چارەسەر:........ ٢٣٧
وەڵامی هەندێ پرسیاری گرنك کە نەخۆش یان کەسوکاری لە پزیشکی دەکەن:........ ٢٣٩

نەخۆش لەم کاتانەدا پێویستی بە چاودێری هەیە : ........ ٢٤١

بەشی شانزەیەم: ........ ٢٤٣

توندوتیژی ........ ٢٤٤

توندوتیژی دوو جۆری هەیە : ........ ٢٤٤

هۆکارەکانی توندوتیژی : ........ ٢٤٤

چارەسەر : ........ ٢٤٩

خۆکوژی ........ ٢٥١

ڕەفتاری خۆکوشتن دەکرێت بە پێنج ئاست : ........ ٢٥١

هۆکارە ترسناکەکانی خۆکوشتن : ........ ٢٥٢

هۆی خۆکوشتن : ........ ٢٥٥

ڕێگاکانی خۆکوشتن : ........ ٢٥٧

ئایا نەخۆش مافی خۆکوشتنی هەیە ؟ ........ ٢٥٨

چارەسەر : ........ ٢٥٩

بەشی حەڤدەیەم : ........ ٢٦٢

نهێنی پارێزی ........ ٢٦٣

مافەکانی نەخۆش ........ ٢٦٧

پێـڕسـت ........ ٢٦٩